# ناوەڕۆک

# سەرەتا

من "زمانەوان" نیم، ئەگەرچی تێبینیم لەسەر ئەو وشە و پیشەیە هەیە!. زمانەوانی؛ نابێت پیشە بێت، بەڵکو دەبێت کاری هەر کەسێک بێت بۆ باشترکردنی گفتوگۆکانی. نووسینیش گفتوگۆیەکی بێدەنگە، مرۆڤ چۆن کار بۆ ئەوە دەکات کوردواتەنی دەم و لەبزی خۆش بێت، دەبێت بەهەمان شێوە کاریش لەسەر ئەوە بکات، ئەوەی دەینووسێت پاک و پەیوەست بێت بە رێساوە. هەر لەو روانگەیەوە دەگووترێت فلان کەس دەم پیسە یان قسە نازانێت و دەریدەپەڕێنێت! ئەگەر ئەمانە ببن، ئەدی بۆ نووس"پیس"یش نەبن!. دەبێت جیاوازیی نێوان دەم پیس و نووس پیس چی بێت. یان ئەو منداڵەی کە هێشتا زمانی پاک نەبووەتەوە و هەندێک وشە بە روونی بەزمانیدا نایەت لەگەڵ ئەو کەسە جیاوازیی چی بێت کە بە رێنووسێکی خراپ و داشکاو و دوور لە هەر رێسایەکەوە دەنووسێت.

لە تەمەنێکی زۆر زوومەوە دەستم کردووەتە خوێندنەوە. لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە دەنووسم، کە وا بۆ سی ساڵ دەچێت. لەم سی ساڵەی نووسینمدا کۆمەڵێک باری سەرنج و رەخنەم لا گەڵاڵە بوون، هەرگیز نەمویستووە رۆژێک لە رۆژان نووسینێکی وا تا رادەیەک درێژ لەسەر رێنووسی کوردی بنووسم، بەڵام دەمێکە هەستم بەوە کردووە کە لەوانەیە کەلێنێک پڕبکاتەوە. بەتایبەتیش کە لە ناوەڕاستی نەوەدەکانەوە، هەربەهۆی نووسینەوە کەوتمە ناو جیهانی سفر و یەکەوە و بۆ ماوەیەکی زۆریش کاری بەرنامەوانی و دروستکردنی ماشێنی گەڕانم کردووە. زۆرچاک بۆم دەرکەوتووە کە کێشەکانی زمان و رێنووسی ئێمە لەو زانستەدا چییە، خاڵی لاوازمان چییە، چۆن باشتری بکەین تاوەکو بەشێوەیەکی زۆر باشتر سوود لە زانستی تەکنەلۆجیای زانیاری وەربگرین و ئەوەی هەمانە و دەمانەوێت ئەرشیڤی بکەین بە شێوەیەکی زانستییانە بیکەین، پاشانیش لە هەمووی گرنگتر ئەوەی دەمانەوێت لەو ئەرشیڤەماندا بە ئاسانی بیدۆزینەوە.

هەربۆیە بیرۆکەی ئەم نووسینەم لەوەوە سەرچاوەی گرتووە و هیوادارم ببێتە دەرگایەک بۆ گفتوگۆ و پێکهێنانی رێنووسێکی کوردیی بێ کێشە بۆ هاوزمانانی باشوور و رۆژهەڵات، کە بە سکریپتی ئارامی یان عەرەبی دەنووسن.

هاورێ باخەوان
لاهای - هۆڵندا
17-12-2014
رۆژی ئاڵا

# چیمان هەیە و چۆن بیگونجێنین!

بەتەواوی پروام بەوە هەیە کە چەندێک نووسەر هەبن، ئەوەندەش ڕێنووسی کوردی بیێت! ئەمە هەردەم پێم کارەساتێکی گەورە بووە، دیارە خۆشم لە دەرەوەی ئەو بازنەیە نیم و لەم کاتەدا کە ئەم دێرانەی من دەخوێنیتەوە، هەست دەکەیت کە ڕێنووس و شێوازی نووسیم جوودایە لە هی تۆ و ئەو.
هەر بەو پێودانگە، زۆر ئاساییە کە زۆرێک لە ڕێنووس و شێوازی منت پێ هەڵە بێت، ئەوانەشی کە پێت هەڵەیە، لەوانەیە هەندێکیان ڕاست بێت، تۆ هەڵە بیت و ئەوانەی من ڕاست بن و تۆ هێشتا پەییت بەوە نەبردبێت.. یانیش لە نەزانینی هەردوو لامانەوەیە، چونکە هیچ کاتێک نە من و نە تۆش پەروەردەیەکی ڕێنووسیی ڕاست و زانستیمان نە لە مامۆستا و نە لەماڵیشەوە وەرنەگرتووە!.

کێشەی ڕێنووس، لەوانە بوو کە پێشتر کارەساتێکی ئەوتۆ نەبووایە، چونکە زانیاریی کوردی تەنها و تەنها بەهۆی دەسنووس و لەم دواییەشدا بەهۆی چاپکردنەوە کەوتە سەر پەڕە و پێشتر ئەوەی کە ئێستا پێی دەگووترێت تەکنەلۆجیای زانیاری - Information Technology لامان دیارنەبوو.
دیارە کێشەکەی ئێمە زۆرتر لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە هەوڵەکان بۆ باشترکردنی ڕێنووسی کوردی یەکگرتوو نەبوون، چونکە "زمانەوان"ەکانی ئێمە لەوەتەی کێشەی ڕێنووس هاتووەتە کایەوە، دابەشبوون بەسەر ڕێنووسی ئارامی و لاتینیدا، هەندێک جاریش ڕێنووسی سلاڤی باسی لێوەکراوە و ئەو کتێب و گۆڤار و بڵاوکراوانەشی کە لە یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوودا بە سلاڤی نووسراون ئەو کەمە نین!.
من لێرەدا بەهیچ جۆرێک توخنی ئەم ڕێنووسی سلاڤییە ناکەوم، چونکە یەکەم فرم بەسەرییەوە نییە و دووەمینیش خۆشبەختانە ئەم ڕێنووسە هیچ بەختێکی نییە کە ببێتە ڕێنووسی ستانداردی کوردی.
زۆرتر لەم نووسینەدا باس لە ئارامی یان ڕێنووسی عەرەبی دەکەم و جارجاریش وەک بەراوردێک، لایەکیش لە ڕێنووسی لاتینی دەکەمەوە.
ڕێنووسی لاتینی ئەگەرچی لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لەوانەیە لە ڕۆژئاواش دژایەتیی بکرێت بەهۆی ڕێنووسی عەرەبی و

فارسییەوە، بەڵام دەکرێت بگووترێت کە لایەنگرانی زۆرترە لە کوردستاندا، بەو پێیەی کە هەموو باکوور و رۆژئاوا بەو رێنووسە دەنووسێت، دیارە ئەمە لە خۆشەویستییانەوە نییە بۆ رێنووسی لاتینی بەڵکو هێزکارێکی زۆری رێنووسی تورکییە کە لە سەرەتای سەدەی بیستەوە لە ئارامییەوە کرایە لاتینی!.

کورد، لەوە ناچێت هەرگیز رێنووسی نەتەوەییی خۆیی بوویێت! لێرە و لەوێ، جارجارە دەقێکی کۆن بە زمانی ئاڤێستا دەبینرێت و دەگووترێت کە ئەمە رێنووسی کۆنی کوردە، بەڵام ئێمە تاوەکو ئێستا، نە زەردەشتمان وەک پێغەمبەرێکی کورد پێ ساغکرایەوە! نە توانیشمان ئاڤێستا و ئەو زمان و رێنووسەی کە پێی نووسراوە بکەینە هی خۆمان.. زەردەشت و ئاڤێستا تەنها بەوە نابێتە هی ئێمە، بەوەی ناوی منداڵەکانمان و کۆمەڵێک ناوەندی رۆشنبیریی پێ ناوبنێین! بەڵکو دەبووایە سەدان لێکۆڵینەوەی گرنگمان لەسەر خاوەندارێتیی ببوایە و بکردایە. هەربۆیە هەموو هەوڵێک بۆ بەکارهێنان و بوونی رێنووسی ئاڤێستا و ئەوانەشی کە پاشتر لەسەر بنچینەی ئەو دامەزران بە دوور دەزانم..

ڕێنووسی زمانە پێشکەوتووەکانی جیهان هەر لەخۆوە نەگەیشتوونەتە ئەم ئاستە بەرزەی ئێستا، ئەوانیش پێشتر کێشەی زۆریان هەبووە و زۆریان کردووە تاوەکو بگەنە ئەم ئاستە. دیارە ڕێنووسی کوردی بە سکریپتی ئارامی-عەرەبیش هەر بە هەمان پرۆسەدا ڕۆییشتووە، بەڵام پرۆسەکەی زۆر لەو زمانە پێشکەوتووانە کورتترە، ئەمەش بەهۆی دواکەوتنی نووسینی کوردییەوە بووە، بۆ نموونە ئەگەر نالی سەدەیەک پێشتر بژیابایە و هەر هەمان سرووشی "خۆ کوردییە خۆ کردییە"ی بۆ بهاتایە، ئەوا دڵنیابووم کە ئێستا کێشەمان کەمتر بوو و ڕێنووسی کوردی سەد ساڵێک لە ئێستای پیر تر دەبوو و ئەم گەڕەلاوژێیەی ئێستاش کەمێک ئارامتر دەبووەوە!.
من، پاش خوێندنەوەی کتێبی (کوردستان و کورد)ی (محەمەد ئەمین زەکی بەگ)، کە یەکێکە لە کتێبە کۆنەکانی کورد کە بە ڕێنووسی ئارامیی ئەو کاتە نووسراوە، زۆرجاری تر ئەو کتێبەم بە مەبەستی شارەزابوونی ڕێنووسی ئەو سەردەمە تاووتوێ کردووە، بەراوردکردنی ڕێنووسەکەی گەورەی بەگم و من زۆر جیاوازیی هەیە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کارمان لە ڕێنووسەکەماندا کردووە، دیارە هێشتا زۆری ترمان لە پێشە، هەر هەمان بەراووردیشم کردووە لەنێوان دوو تێکستی چاپکراوی زمانێکی ئەورووپی یان عەرەبیی سەردەمی سەرەتای سەدەی بیستەم و ئێستا، بەڵام جیاوازییەکی زۆر کەم نەبێت لە باری ڕێنووسەوە کە زۆرترینیان خاڵبەندین! تیایدا بەدی ناکەیت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوان لە ئێمە زۆرتر کاریان لە ڕێنووسیاندا کردووە و بەپێی ئەو بەراوورده بێت، دەبێت ئێمە سەدەیەک یان زۆرتر لە دووای ئەوانەوە بین!.

بعض فکری چاك وبه فائدەی هەبێ اولاًنه کە بعض رفیقانیا
مذاکرەی بکا واگر مناسب بو به صورتیك تقدیمی مجلس بکا
وبو پیك هینانی له موضوع-ـی قصور نکا ؛ وهرایشی کە له طرف
حکومتەوە دینریتە مجلس وقناعتی به فائدەی هەمین وظهیری بێ
واکر بعض فکری مناسبتری هەبێ بیانی بکا وحکومت ومجلس
ارشادکا ؛ وهیچ وقتێ نه به سوقی غرضی شخص ونه به قصەی
لم واو خوی نه هاویتە نارەوە وهراو زەنای بیسود وبی معنانه کا؛
چونکێ اگر بی کا اولا موفق به خدمت کردن نابێ وجگه لەمەش له
لایکەوە خوی بیا وخراب دەکا ، وله لایکی تریشەوە آبروی
موکلەکانی ووطنەکەیشی دەبا . لازمە لەسری کە دائما ملاحظەی
حل واحوال بکا وله افراط وتفریط خوی بپاریزی دائما دورندیش
ومعتدل بێ ؛ له فکر وقناعتدا ثابت بێ وفرفری نه بێ وله پیش
طلب کردنی هرشتیکدا ملاحظەی امکانی بکا .

وظیفەی خصوصی تقریبا امەیه کە همو نائبێ دبێ اولا شارەزای
دائرەی انتخابیەی خوی بێ ، احتیاجات ونواقصی بزانێ وبوامەش
دەبێ فرصتی زیارتی دائرەکەی بدوزیتەوە ـی بکا بوچاوپێ کوتنی
همولایەکی واگر فرصتی بنو کە هموی بکەرێ لەمأمورین ورؤساو

نموونەیەکی ڕێنووسی محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە بیستەکانی سەدەی بیست

*Ham.* To be,or not to be, I there's the point,
To Die, to ſleepe,is that all? I all:
No,to ſleepe,to dreame, I mary there it goes,
For in that dreame of death, when wee awake,
And borne before an euerlaſting Iudge,
From whence no paſſenger euer retur'nd,
The vndiſcouered country, at whoſe ſight
The happy ſmile,and the accurſed damn'd.
But for this,the ioyfull hope of this,
Whol'd beare the ſcornes and flattery of the world,
Scorned by the right rich,the rich curſſed of the poore?
The widow being oppreſſed,the orphan wrong'd,
The taſte of hunger, or a tirants raigne,
And thouſand more calamities beſides,
To grunt and ſweate vnder this weary life,
When that he may his full *Quietus* make,
With a bare bodkin, who would this indure,
But for a hope of ſomething after death?
Which puſles the braine, and doth confound the ſence
Which makes vs rather beare thoſe euilles we haue,
Than flie to others that we know not of.
I that,O this conſcience makes cowardes of vs all,
Lady in thy orizons, be all my ſinnes remembred.

نموونەیەکی ڕێنووسی یەکەم چاپی هاملێت لە ساڵی **1603**

واستخدمت حروف هذه القاعدة الجديدة لأول مرة فى طبع الوقائع المصرية الصادرة فى أول ديسمبر سنة ١٩٠٦ ، ومع ذلك فلم يطبع كل العدد بها وإنما اقتصر استعمالها فى الأخبار الرسمية فقط ، أما بقية مادة العدد فطبعت بالحروف القديمة . ثم طبع العدد من الوقائع الصادر فى أول يناير سنة ١٩٠٧ كله من هذه الحروف الجديدة . وأخذت تستعمل فى كل مطبوعات المطبعة تدريجيا منذ ذلك التاريخ . وكان على كل من اللجنة والمطبعة بعد ذلك أن تعد من هذه القاعدة بقية الأجسام "بنط" ٩و١٢و١٨و ٢٤و٣٠و٣٦ و٤٨ ، وقاعدة الرقعة(٣) . وكان مجموع ما صب من حروف هذه القاعدة فى آخر سنة ١٩٠٦ هو ١٧,٠٠٠ كيلوجرام وكلها من "بنط" ١٥ ، وفى آخر سنة ١٩٠٧ كان قد وصل هذا القدر الى ٢٧,٠٠٠ كيلوجرام(٤) . ولم تكن بقية الأجسام قد بدئ فيها بعد. وهذه القاعدة هى التى ما زالت مستعملة إلى الآن فى المطبعة .

نموونەیەکی ڕێنووسی عەرەبی لە سەرەتای سەدەی بیست، کە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆ لەگەڵ ئەوەی ئێستایاندا بەدی ناکرێت

پێش ئەوەی بچمە خوارە بەم نووسینەمدا، سەرنجتان بۆ وتارۆکەیەکی خۆم لە گۆڤای کۆواردا رادەکێشم و پاش خوێندنەوەی ئەو نووسینەم زۆرتر باس و خواستمان لەسەر ئەم کێشەیە دەبێت:

کارەساتی رێنووسی کوردی و دنیای دیجیتاڵ!

لە گووگڵدا دەمویست بەدوای محەمەد ناوێکدا بگەڕێم! هەرچەندم کرد (حەمە)م بۆ نەدۆزرایەوە! بە عەرەبی نووسیم (محمد) هەر لە ئەندەنووسیاوە تاوەکو مۆریتانیای پیشاندام! پاشان نووسیم (محەمەد) هەر نەبوو! دیسان نووسیم (محەممەد) ئەویش هەر نەبوو! دواتر وەك ئیسلامییە سەلەفییە "کورد"ەکان ناوی (موحەممەد)یشم تاقیکردەوە! هەموو جوندولئیسلام و یەکگرتوو و کۆمەڵی ئیسلامیی پیشاندام!. بەڵام حەمەی لەمەڕ من هەر دەنگی نەبوو! خۆ ئەگەر هەر حەمەی رووت بنووسیت! ئەوا هەرچی حەمە سەعید و حەمە ساڵح و لەوانەیە نیوەی کوردت پیشان بدات!
بە کوورتی (حەمە، محمد، موحەمەد، محەممەد، موحەممەد، موحەمەد، حەمەد و زۆریتر...)م تاقیکردەوە! لەناو محەمەدستاندا بەتەواوەتی ونبووم و وازم لەگەڕانەکەم هێنا!
لەم رۆژانەدا وتارێکم بەرچاوکەوت و باسی پۆلێکی سەرەتاییی قوتابخانەیەکی هەولێری دەکرد، کە لە کۆی نزیکەی پەنجا منداڵی پۆلەکە، بیستوهەشتیان ناوی (حەمە، محمد، موحەمەد، محەممەد، موحەممەد، موحەمەد یان حەمەد)ە!.. ئەم هەموو ناوی محەمەدە، کێشەیەکی زۆریشی بۆ مامۆستاکانی ئەو پۆلە دروستکردووە و ناچاربوون بۆ هەر حەمەیەك کۆدێکی تایبەتی دابنین تاوەکو لەیەکترییان جیابکەنەوە!. کار وایڕوات ناوی محەمەد وەك پاشناوی (لی)ی چینیی لێدێت کە ژمارەکەی وابزانم لە هەموو کورد زۆرترە!.
سەیرە ناوێك ئەوەندە لە کوردەواریدا بەکاربێت، کەچی نەتوانین رێنووسێکی یەکگرتووی بۆ دیاریبکەین!
من باسی ئەوە ناکەم کە بۆچی پاش بیست ساڵ سەربەخۆیی ناوی بێگانە لەناوماندا زۆرتر پەرەی سەندووە! بەڵکو تەنها باسی رێنووسەکەی دەکەم..

ئینگلیزە نامسوڵمانەکان زۆر لە ئێمە ژیرتر بوون و ئەوان هەر زوو رێنووسێکی یەکگرتوویان بۆ ناوە عەرەبییەکان داهێنا! بۆ نموونە هەموویان بەیەك جۆر دەنووسن موهەمەد! کەچی ئێمە سەرباری ئەوەی کە هەزار و ئەوەندە سەد ساڵە بە زمانی محەمەدانییەکان ویرد دەخوێنین و سەڵاوات لە ناوی محەمەد دەدەین، نەمانتوانیوە بەیەك جۆر ناوی بۆ نموونە محەمەد بنووسین!.
حەمەم تەنها بۆ نموونە هێنایەوە، ئەگینا هەریەك لە رەوف، رەووف، رەئووف، تاهیر، تاهر و تایەر و سەدان و زۆرتری ئەو ناوانە، کارەساتێکن بۆ رێنووسی کوردی!.
ئێمە وەك نەمانتوانی تاکە هەنگاوێکیش بەرەو زمانی ستاندارد بنێین، کەچی نەشمانتوانیوە کەمێك لە رێنووسی ئەو ناوانە بکەینە رێسایەك و بیچەسپێنین..
جیهانی دیجیتاڵ، جیهانێکی زۆر هەستدارە، بۆ ئێمە (حەمە، محمد، موحەمەد، محەممەد، موحەممەد، موحەمەد، حەمەد و زۆریتر...) لەوانەیە لای ئێمە یەك بن. بەڵام بۆ ماشێنی گەڕان و داتابانکەکان هەر یەکەیان کلیلە وشەیەکی جوودان.. هەربۆیە هەردەم کێشەمان بۆ دروستدەکەن و کێشەکەش گەورەیە نەك بچووك!..
نازانم وەزارەتی (رۆشنبیری) بیری لەم کێشەیە کردووەتەوە! یان هەرگیز بەکێشەی نەزانیوە! یان ئایا وەزارەتی خوێندنی (باڵا) بیری لەوە کردووەتەوە کارێکی واهی بە کۆلیجەکانی کۆمپیوتەر بسپێرێت کە هیچ نەبێت سپێڵ چێکێکی کوردی دروستبکەن و لەگەڵ نەرمەواڵاکانی مایکرۆسۆفت و ئەوانی تردا ناوکێشی بکەن و بەهۆیەوە کەمێك رێنووسەکەمان رێکبخەین...

وتارەکە، لێرەدا تەواو بوو، ئەمە لە ژمارە 73ی مانگی 1ی 2012دا لە دوا لاپەڕەی گۆڤارەکەدا بڵاوکرایەوە.

بەم شێوە و شێوازی نووسین و رێنووسەی ئێستامان زۆر ئەستەمە بتوانین هەموو لایەنە باشەکانی زانستی تەکنەلۆجیای زانیاری بەکاربهێنین! هۆکارەکەشی زۆر ئاسانە، لە زانستدا یەک و یەک دەکاتە دوو، بەڵام ئێمە زۆرجار لە رێنووسەکەماندا دەمانەوێت بڵێین یەک و دوو دەکاتە یەک! یان یەک و سێ دەکاتە یەک! کە ئەمە بۆ زانستی

تەکنەلۆجیای زانیاری سەرلێشێوانە و سەرئەنجامێکی باشمان لەگەڵیدا نابێت..
زانستی تەکنەلۆجیای زانیاری، ناوی خۆی بەخۆیەوەیەتی، هەموو شتێک لەم زانست و تەکنەلۆجیایەدا لە خزمەت و باشترکردنی زانیاریدایە، زانیارییەکانیش دەکرێت تێکست بێت یان وێنە و دەنگ. ڤیدیۆش وەک بەشێکی گرنگی ئەم زانستە دەچێتە خانەی وێنەوە، چونکە فیلم، جگە لە زنجیرە وێنەیەک هیچی دیکە نییە.

بانکی زانیاریی چ کوردی، چ ناکوردی وەک جاران سنووردار نییە. پێشتر لە کتێبخانەیەکی وەک شاری سلێمانیدا تەنها یەک دوو هەزار کتێبێکی کوردی و ناکوردیی تێدابوو. بەڵام لەم کاتەدا ماڵپەڕێکی وەک کوردیپێدیا زۆرتر لە شەش هەزار کتێبی دیجیتاڵی لەخۆگرتووە!.
ئەم هەموو زانیارییە زۆرە، گەر بەشێوەیەکی پوخت تۆمار نەکرێن، ئەوا دیارە مامەڵە و دۆزینەوەشیان ئاسان نابێت!.

پێشتر کە سەردانی کتێبخانەیەکم بکردایە و بمویستایە هەمان پەڕتووکی کورد و کوردستانی گەورەی بەگمم بدۆزیایەتەوە، یەکسەر بیرم بۆ چەکمەجەی پیتی "ز" بۆ زەکی یان "ب" بۆ بەگ دەچوو و پەڕتووکەکەم دەدۆزییەوە! ئێستا ئەگەرچی بەهۆی تەکنەلۆژیای زانیارییەوە دەبووایە بەئاسانتر بمدۆزیبایەتەوە! بەڵام گرانتر بووە لەبەر خراپیی ڕێنووسەکەمان!.
هۆکاری ئەو کێشەیە ئەوەیە کە نازانیت ئەو کەسەی کە ئەو پەڕتووکەی تۆمارکردووە چۆنی نووسیوە! چونکە هیچ ڕێسایەکی واهی نییە بۆ ڕێنووسەکەمان کە ئێمە پێیەوە پەیوەست بین.
هەر بۆیە لەوانەیە تاوەکو ئەو کتێبەت لەسەر ئنتەرنێت بۆ دەدۆزرێتەوە، ئەم گریمانانە لە ڕێگەی کیبۆردەکەتەوە ئەنجام بدەیت، تکایە باش تێبینیی پیتە جیاوازانی ناو کەوانەکان بکە:

1. (ک)ورد و (ک)وردستان
2. (ك)ورد و (ك)وردستان
3. (ک)ورد و (ك)وردستان
4. (ك)ورد و (ک)وردوستان

5. (ک)ورد و (ک)وردوستان
6. (ك)ورد و (ك)وردوستان
7. (ک)ورد و (ك)وردوستان
8. (ك)ورد و (ک)وردوستان
9. (محمد) ئ(ە)م(ی)ن زە(ک)(ی) ب(ە)گ
10. (ح(ە)م(ە)) ئ(ە)م(ی)ن زە(ک)(ی) ب(ە)گ
11. (مح(ە)م(ە)د) ئ(ە)م(ی)ن زە(ک)(ی) ب(ە)گ
12. (موح(ە)م(ە)د) ئ(ە)م(ی)ن زە(ک)(ی) ب(ە)گ
13. (مح(ە)م(ە)د) ئ(ە)م(ی)ن زە(ک)(ی) ب(ە)گ
14. (موح(ە)مم(ە)د) ئ(ە)م(ی)ن زە(ک)(ی) ب(ە)گ
15. (...) ئ(ە)م(ي)ن زە(ک)(ی) ب(ە)گ
16. (...) ئ(ە)م(ی)ن زە(ک)(ي) ب(ە)گ
17. (...) ئ(ە)م(ی)ن زە(ك)(ی) ب(ە)گ
18. (...) ئ(ە)م(ي)ن زە(ك)(ی) ب(ە)گ
19. (...) ئ(ە)م(ی)ن زە(ك)(ي) ب(ە)گ
20. (...) ئ(هـ+ZWNJ[1])م(ی)ن زە(ک)(ی) ب(ە)گ
21. (...) ئ(هـ+بۆشایی[2])م(ی)ن زە(ک)(ی) ب(ە)گ
22. (...) ئ(ة)م(ی)ن زە(ک)(ی) ب(ە)گ

لێرەدا بەم بیست و ئەوەندە گریمانەیە وازدێنم و دڵنیام ئەگەر هەموو گریمانەکانی محەمەد، پیتی کاف، پیتی یاء و بزوێنەکان دروستبکەم، ئەوا بە ئاسانی دەگەمە سەروو سەد!. واتە ئەگەر ماشێنی گەڕانەکە زۆر زیرەک نەبێت، لەوانەیە دوا گریمانی من بیدۆزێتەوە و بزانن چەند کاتمان دەوێت تاوەکو ئەو هەموو گریمانەیە دەنووسین!. چونکە هەر یەک لەو پیتانە کۆدی جیاوازی خۆیی هەیە و پاشتر لەو کۆدانە دەدوێم. هەڵبەت هەموو کەسێکیش شارەزاییی تایپکردنی ئەو هەموو گریمانانەی نییە تاوەکو هەرچی چۆنێک بێت تۆمارەکە بدۆزێتەوە!

[1] ZERO WIDTH NON-JOINER
ئەمە پیتێکی نادیارە و بەلای منەوە یەکێکە لە کارەساتەکانی ڕێنووسی دیجیتاڵی کوردی و پاشتر دێمەوەسەری.
[2] Space

خۆشبەختانە ئەو نموونەیە لەچاو دەستەواژەی تردا زۆر ئاسانە! چ دەبوو سەرباری ئەو پیتانە، پیتەکانی وەک ڤ، گ، ۆ، ێ، ڵ، پ و هتد لەخۆبگرتایە! ئەوکات گریمانەکان لە سەد دانەوە دەبووە سەدان یان زۆرتر!.

لەمەوە تێرامێنن، ئەگەر رێنووسەکە ستاندارد نەبێت و هەریەک بە ئارەزووی خۆی ئەو دوو دەستەواژەیەی سەرەوە بنووسێت، کاری گەڕان چەند گران دەبێت، هەربۆیە زۆرکەس خۆزگە بە چەکمەجە کۆنەکانی کتێبخانەکان دەخوازێت، چونکە نازانێت محەمەد چۆن بنووسێت، زۆر کەسیش لەوە بێئاگایە کە لە کوردیدا دوو جۆر کاف و چەند جۆر یاء و چوار جۆر هەمزە بەکاردێت!.

بەڵام ئەگەر هەمووومان لەسەر ئەوە رێکبکەوین کە دەستەواژەی یەکەم بە "کورد و کوردستان" و دووەمیش بە "محەمەد ئەمین زەکی بەگ" بنووسرێت، ئەوا ئەو گریمانانە نایێتە کێشەمان و بەچەند چرکەیەک، ئەوەی دەمانەوێت، دەستمان دەکەوێت!.

هەروەک چۆن ئینگلیز محەمەد بە Muhammad دەنووسێت و لەسەری رێککەوتوون و کەس بەم شێوانەی خوارەوە نایاننووسێت:

1. Mohammad
2. Muhamad
3. Muhaammad
4. Muhammaad

هەتا دوا گریمانەکانی تر...

ئەگەرچی، بەهۆی گونجاندنی پیتە تایبەتییەکانی کوردی لە چوارچێوەی یونیکۆددا، تاڕادەیەک کێشەکانمان کەمدەبنەوە، بەڵام ئەمە زۆر پابەندە بە چۆنێتیی بەکارهێنانی ئەو پیتانەوە لە رێنووسەکەماندا.

لێرەدا دەبێت بڵێم بەداخەوە، زۆرینەی ئەو هەوڵانەی دراون بۆ چاککردنی رێنووسی دیجیتاڵی کوردی، هەوڵی تاکەکەسی و چەند گروپێک بوون، وەزارەتەکانی وەک پەروەردە، خوێندنی باڵا و رۆشنبیری هیچ گرنگییەکیان بەم لایەنە نەداوە! تەنانەت تاوەکو ئێستاش ئەو فۆنت و کیبۆردانە بەکاردێنن کە لەلایەن تاکەکەس و ئەو گروپانەوە بەشێوەیەکی خۆبەخش دروستکراوە.. من تا ماوەیەکیش نووسراوی ئەو وەزارەتانەم

بینیوە کە پیتی "ڤ" یان وەک "ڤـ" دەنووسی چونکە ئەو کەسە یان ئەو گروپەی کە ئەو پیتانەی دروستکردبوو، لە ماپینی فۆنتەکانیدا هەڵەیەکی کردبوو و ئەوانیش ئاشە نەزانەکەیان لەلایەن دروستکەری ئەو فۆنتانەوە دەگێڕا!.

# کێشەکانی ئێمە چین؟!

کێشەی ئێمە تەنها ئەو پیتانە نین کە زمانی کوردی لە عەرەبی، فارسی و ئوردو و ئەوانی تر جیادەکاتەوە کە بە هەمان سکریپت دەنووسن! بەڵکو بەڕای من گەلێک لەوە گەورەترە..
لێرەدا بە پێویستی دەزانم بەشێوەیەکی تێپەڕ باسی یونیکۆد بکەم و لیستی یونیکۆدی پیتە "کوردی"یەکانیش ریز بکەم تاوەکو لە باسەکانی تردا ئاماژە بۆ ئەو لیستە بکەم لە کاتی پێویستدا.

## یونیکۆد - Unicode

یونیکۆد، یان کۆدی یەکگرتوو، پڕۆژەیەکە بۆ دانان و ئافراندنی پیتەکان لەسەر کۆمپیوتەر، یونیکۆد زانستێکە بۆ چنینی پیتەکان کە لەسەر هەموو پلاتفۆرمێک هەمان بەها و رووخساری هەیە. ئاڵوگۆڕکردنی ئەم پیتانەش لە هەر پلاتفۆرمێکەوە بۆ یەکێکی تر نابێتە هۆی تێکچوونی پیتەکان.
بۆ نموونە پیتە کۆنە نایونیکۆدە کوردییەکان، گەر وەربگێردرێتە سەر هەر جۆرە پیتێکی تر، بەتایبەتی یونیکۆد، کاراکتەرەکانیان دەگۆڕدرێن، وەک دەستەواژەی "کۆدی یەکگرتوو"، دەبێتە "كؤدي يةكطرتوو"!. دیارە ئەمەش بەپێی ماپینگی ئەو فۆنتەی کە پێی چنراوە دەگۆڕدرێت.
تێکستێکی یونیکۆد لە ماکنتۆشەوە بۆ پی سی و لە پی سیشەوە بۆ لینۆکس یان بۆ ئەندڕۆید تاڕادەیەکی زۆر هەمان کاراکتەر و رووخساری هەیە، دیارە قەبارە و بەهاکەشیان وەک یەکترییە و بووەتە ستانداردێکی جیهانی و شۆڕشێکی گەورە بوو لە بواری کۆمپیوتەر و زانستی فۆنت و پیتچنیندا.

خشتەی یونیکۆد لە ئێستادا نزیکەی سەدهەزار پیتە. زۆرینەی فۆنتە بەناوبانگە جیهانییەکانی وەک تاهۆما، تایمس نیو رۆمان، ئاریەڵ و ڤێردانا[3] و هتد پراکتیکی رێساکانی یونیکۆد دەکەن و بەو هۆیەیەوە کێشەی کرۆس پلاتفۆرمی[4] فۆنتەکان چارەسەر بووە. ئەم زانستە لە ساڵی 1991ەوە لە برەو و پێشکەوتندایە و تاوەکو ئێستا زۆرتر لە پێنج ڤێرشنی گەورەی دەرچووە.
زمانی کوردیش زۆر سوودی لەم زانستی یونیکۆدە وەرگرتووە، بەڵام دەکرێت سوودەکان باشتر و زۆرتر بکرێت بەهۆی هێنانەکایەی چەند یاسا و رێسایەک تاوەکو بەشێوەیەکی باشتر سوودی لێببینین.

## لیستی پیتە کوردییەکان و یونیکۆدەکانیان[5]

| پیت | ناو | بەهای یونیکۆد |
|---|---|---|
| ا | ئا | U+0627 |
| ب | بێ | U+0628 |
| پ | پێ | U+067E |
| ج | جیم | U+062C |
| چ | چیم | U+0686 |
| د | دال | U+062F |
| ە | بزوێن - هەمزە | U+06D5 |
| ف | فا | U+0641 |
| گ | گاف | U+06A9 |

[3] Tahoma, Times New Roman, Arial, Verdana
[4] Cross Platform
[5] ئەم لیستەیە لە بەرنامەی Charmapی مایکرۆسۆفت ویندۆزەوە دروستکراوە.

| | | |
|---|---|---|
| هـ | ها | U+0647 |
| ح | حا[6] | U+062D |
| ژ | ژێ یان ژال | U+0698 |
| ک | کاف | U+06A9 |
| ل | لام | U+0644 |
| ڵ | ڵام | U+06B5 |
| م | میم | U+0645 |
| ن | نون | U+0646 |
| ۆ | ۆ | U+06C6 |
| ق | قاف[7] | U+0642 |
| ر | را | U+0631 |
| ڕ | ڕا | U+0695 |
| س | سین | U+0633 |
| ش | شین | U+0634 |
| ت | تا | U+062A |
| ئـ | ئ | U+0626 |
| ڤ | ڤا | U+06A4 |

[6] پیتی "ح" لە کوردیدا نییە و لە عەرەبییەوە پەڕیوەتە ناو زمانەکەمان، لە هەندێک ناوچەی کوردستان "هـ" بەکاردێنرێت، بەتایبەتی لە کرماشان و ئیلام.

[7] پیتی قاف لە کوردیدا نییە و لە عەرەبی و تورکییەوە پەڕیوەتە ناو زمانەکەمان.

| | | |
|---|---|---|
| و | واو | U+0648 |
| وو | دوو واو[8] | U+0648وU+0648 |
| خ | خا | U+062E |
| ی | یا | U+06CC |
| ز | زال | U+0632 |
| ع | عەین[9] | U+0639 |
| غ | غەین[10] | U+063A |
| ث | ثا، هەورامی | U+062B |
| ذ | ذال، هەورامی | U+0630 |
| ە | بزوێنی هەڵە کە بریتییە لە دوو پیت. دیارە دوو بەهای یونیکۆدیشی هەیە! | **U+0647** و **U+200C** |

---

[8] دوو واو، لە راستیدا ئەمە یەک پیت نییە و هەندێک پیتچن بۆ ئاسانکاری ئەم پیتیان خستووەتە سەر تەختە کلیلە کوردییەکان! ئەم دوو واوە دوو بەهای دووبارەی یونیکۆدی هەیە و ناکرێت بەیەک پیت ئەژمار بکرێت! سەیرەکە لەوەدایە پیتچنەکان وایانزانیوە کە ببێتە یەک کلیل پرۆسەی تایپکردن خێرادەکات، بەڵام تایپکردنی ئەم دوو واوە بەهۆی کلیلی شیفت و کلیلێکی ترەوە دەبێت کە لە زۆر باردا پیتی واوی تەنهایە، کە خۆی لە خۆیدا دووجار پەنجەدانانە لەسەر کیبۆردەکە، کەواتە دروستکردنی ئەم دوو واوە وەک کلیلێکی سەربەخۆ و بە شیفتەوە کارێکی نەشیاوە!.

[9] پیتی عەین، لە کوردیدا نییە و لە عەرەبییەوە پەڕیوەتە ناو زمانەکەمان. لە هەندێک ناوچەی کوردستان "ئ" بەکاردێنرێت بەتایبەتی لە کرماشان و ئیلام.

[10] پیتی غەین، پیتێکە دڵنیا نیم لە کوردیبوونی و هەندێک وشەی زۆر کەممان هەیە کە ئەم پیتەی تێدا بێت، وەک غار، کاغەز، غەرغەرە، باغ، باغەوان...
من زۆر لەگەڵ لابردنی ئەم پیتەدام لەسەر کیبۆردەکەمان و لەجیاتیی ئەو پیتی "خ" بەکاربێت. لەم رووەوە پیتی Qیش لە کوردیی لاتینیدا بە پێویست نابینم و دەکرێت پیتی "K" جێی بگرێتەوە.

| ي | عەرەبی | U+064A |
|---|---|---|
| ك | عەرەبی | U+0643 |

کێشە بنەڕەتییەکەمان چۆنێتیی بەکارهێنانی ئەو پیتانەیە لە نووسینەکانماندا بە ئارەزووی خۆمان و بەبێ ئەوەی پابەند ببین بەهیچ ڕێسایەکی ئەوتۆوە!.
واتە ئەم کێشەیە دووسەرەیە، لە لایەک دەبێت پیتی یونیکۆد بەکاربهێنین، ئەمە تەنها بەس نییە و دەبێت بزانین چ یونیکۆدێک بۆ نموونە بۆ کاف و یاء و هەندێک پیتی تر بەکاردێنین. لە لایەکی تریشەوە دەبێت بزانین چۆن لەو پیتانە وشەکانمان دروستبکەین. کەی بۆشایی دابنێین و هتد.
من، لە نووسینەکانمدا بنووسم: حسێن، تایەر، زایر و تۆش بنووسیت: حوسێن، تاهر و زاهر و ئەویش بنووسێت حسەین، تاهیر و زاهیر! ئەوا چمان بە چ نەکرد و هەزار یونیکۆد بەکاربهێنین، ناتوانین بەشێوەیەکی هاوچەرخانە پیت و ڕێنووس و زمانەکەمان لەگەڵ زانستی تەکنەلۆجیای سەردەمدا بگونجێنین و ئەوەی کە هەمانە بەشێوەیەکی زانستی ئەرشیفی بکەین!.

کامیان ڕاستە!

| من | تۆ | ئەو |
|---|---|---|
| دەچیت! | ئەچی! | دەچی! |
| دەڕێت! | ئەڕێت! | ئەڕێتن! |

جارێ ئەم ناوانەم تەنها بۆ نموونە هێنایەوە و پاشتر لە بەشێکی سەربەخۆدا بە هەندێک پێشنیازەوە ڕیزیان دەکەم.. بەڵام چ دەبێت من بنووسم دەسەڵات و تۆ دەستەڵات و ئەویش دەسەلات! ئەمانە چەند

نموونەیەکی کەمی ئەو کێشە گەورەیەیە کە ئێمە هەمانە و دەبێت زۆر بەگرنگییەوە لێی بڕوانین و بڕیاری لەسەر بدەین..

## کێشەی کاف

| نموونە | "تەواو" | "ناتەواو" | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 1 | کورد - "ک"ورد | کورد - "ك"ورد | جۆری کافەکە لە سەرەتای وشەکەدا دەرناکەوێت، چ کافێکە. |
| 2 | یونیکۆد - یونی" ک"ۆد | یونیکۆد - یونی"ك"ۆد | جۆری کافەکە لە ناوەڕاستی وشەکەدا دەرناکەوێت، چ کافێکە. |
| 3 | هێلک | هێلك | جۆری کافەکە لە کۆتایی وشەکەدا دەردەکەوێت، چ کافێکە. |

لە زمانی کوردیی سۆرانی و بادینیی ئێستادا کە لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی وڵات بەکاردەهێنرێت دەیان تەختە کلیلی دیجیتاڵی بۆ دروستکراوە، ئەم تەختە کلیلانە هیچیان لەلایەن لایەنێکی فەرمییەوە دروستنەکراون، هەربۆیە پەیڕەوی ستانداردەکان نەکراوە، لەم کیبۆردانەدا دوو جۆر پیتی کاف بەکارهێنراوە:

یەکەمیان ک کە بەهای یونیکۆدەکەی بریتییە لە U+0643.

دووەمایان ك کە بەهای یونیکۆدەکەی بریتییە لە U+06A9.

هەڵبەت ئەو دوو جۆرە کافە هەر یەکەیان خاوەن بەهای یونیکۆدن و بەکارهێنانیان هیچ کێشەیەکی نییە! بەڵام دەبێت هەمووومان ڕێکبکەوین لەسەری و نابێت هەردووکیان بەکاربهێنین. هۆکارەکەشی ماشێنی گەڕانەکانن.

لە نموونەی یەکەمدا ئەگەر بەدوای وشەی کوردا بگەڕێین و بەشێوە "تەواو"ەکەی بنووسرێت، ئەوا تەنها شێوە "تەواو"ەکەی لە

سەرئەنجامەکەدا دەستدەکەوێت و شێوە "ناتەواو"ەکان نابینیت! ئەمە لەوانەیە ئەوەی تۆ بە شوێنیدا دەگەڕێیت بە شێوە "ناتەواو"ەکە نووسرابێت!.
هەمان ڕێساش بەسەر نموونەکانی دووەم و سێیەمدا دەچەسپێت، هەر بۆیە زۆر گرنگە ئێمە لەسەر یەکێک لە کافەکان ڕێکبکەوین، دیارە ئەوەی یەکەم زۆرتر فارسییە و ئەوەی دووەمیش عەرەبی. زۆرینەی کیبۆردەکانی ئەم دواییە کافی یەکەم بەکاردێنن. بەڵام ئەو کیبۆردانەشی کە کافی دووەم بەکاردێنن کەم نین و کەسانی زۆر کافی دووەم بەکاردێنن.
ئەم کێشەیە وەک بزوێن کارەسات نییە، هەربۆیە سەرباسی تەواو و ناتەواوی خشتەکەی سەرەوە لەنێوان دوو چوکڵەدا نووسراوە. هەردووکیان دەشێت بەکاربێن، بەڵام دەبێت ڕێککەوتنمان هەبێت لەسەر یەکێکیان.

## کارەساتی بزوێن

ئەم بەشەم ناونا کارەساتی بزوێن، چونکە لە مێژووی ڕێنووسی ئێمەدا هەر کارەسات بووە، بەتایبەتی لە سەردەمی تایپ ڕایتەردا و لە تایپ رایتەرە عەرەبییەکاندا بزوێنی کوردی نەبوو، ئەگەر بتویستایە، بتنووسیایە "هەموو"، دوو بژاردەت هەبوو؛ یان دەبووایە بتنووسییایە "هە موو"، یان "هةموو" و پاشان بە رتووشێکی سپی ئەو دوو خاڵەی سەر تاکەت لاببردایە و بتکورداندایە بۆ بزوێن!.

ڕووناکبیرانی کورد ، ڕەخنەی ئەوە لە باوو باپیرانیان دەگـرن
کە بۆچی کورد تائێستا مـێژوویەکی نووسراوەی تــــەواو و
گشتگری نی یە ، لەگەڵ ئەوەشدا چەندین کێشــەی مـێژوویـی
سەبارەت بە کورد و کوردایەتی لەم سەدەی بیستەمـەدا هەست
پێ دەکەین و هاوکاتیشە لەگەڵ ژیان و تەمـــــەنی ئــەو
ڕووناکبیرانەدا بەبێ ئەوەی چارەسەرو لێکۆڵینەوەیەکی لێـــــوە
کرابـــــن .

نموونەیەکی ڕێنووسی تایپ ڕایتەر

بۆ باشتر تێگەیشتنی ئەم کارەساتە، سەیری ئەم خشتەیە بکە:

| نموونە | تەواو | ناتەواو |
|---|---|---|
| 1 | هەولێر | هە ولێر |
| 2 | هەولێر | هةولير |
| 3 | هەولێر | هەولير |
| 4 | هەولێر | هەولێر - هەولێر |

کەسانێکی زۆر هەن تاوەکو ئێستا وشەی هەولێر بۆ نموونە بە شێوە ناتەواوەکەی دەنووسن وەک لە ئەستوونی ناتەواودا پیشاندراوە.
لە نموونەی یەکەمدا، کەسانێک هەن نازانن کە بزوێنەکە لە چ شوێنێکی کیبۆردەکەیاندایە! هەربۆیە وشەکە بەهۆی سپەیس - بۆشاییەوە دەکەنە دوو وشە! تاوەکو پیتی های دووەمی پێ بکەنە بزوێن. ئەمە کێشەیەکی گەورەیە و لە ماشێنی گەڕانەکاندا ئەو هەولێرەی بەدوایدا دەگەڕێیت چنگت ناکەوێت. مەگەر ماشێنی گەڕانەکە زۆر پێشکەوتوو بێت و مەرجی تەواوی بۆ ئەم جۆرە وشانە و زمانی کوردی دانابێت! کە ئەمە بوونی زۆر کەمە.
هەمان نموونەی یەکەم لە زانستی تێکست پرۆسێسینگ - Text Processingدا زۆر هەڵەیە، چونکە وشەکە بووەتە دوو وشە! بۆ نموونە ئەگەر بەو شێوەیە بنووسیت هەولێر و لە مایکرۆسۆفت ۆرددا کلیک لە بژاردنی وشە بکەیت، ئەمە ئەنجامەکەی دەبێت:




واته، وشەکە بووەتە دووان لەجیاتی یەکێک و ژمارەی پیتەکانیش بووەتە هەفت پیت لەجیاتیی شەش، دیارە بەوهۆیەوە قەبارەی فایلەکەشت بەشێوەیەکی ناپێویست گەورەتر دەبێت.
کێشەیەکی تری ئەم دوو وشەییە ئەوەیە ئەگەر کەوتە کۆتایی رستەوە، بەهۆی درێژیی دێرەکەوە لەوانەیە پرگەی "هە" بکەوێتە کۆتایی دێرەوە و پرگەی دووەم "ولێر" بکەوێتە سەرەتای دێری داهاتووەوە. ئەمە دەبێتە هۆی ناشرینبوونی تێکستەکە و رێچکەی خوێندنەوەش ناخۆش دەکات.
ئەم کێشەیە هۆکارەکەی دەگەرێتەوە بۆ نەبوونی راهێنانی تایپکردن لە قوتابخانەکاندا، ئەگەر خوێنکارانی کورد هەر لە منداڵییەوە فێری ئەوە ببن کە پیتەکان لە کوێدان، ئەوا بەئاسانی دەتوانن بزوێنەکە بدۆزنەوە و بنووسن "هەولێر".

لە نموونەی دووەمدا، کەسێک تێکستێکی نووسیوە و باسی هەولێری کردووە، ئەم کەسە تەختە کلیلی کوردیی نییە، یان هەیەتی و نازانێت لە کوێدایە و بە شێوازە عەرەبییەکەی نووسیویەتی، کە ئەمە کێشەکە ئاڵۆزتر دەکات، چونکە لەوانەیە یائەکەی بە کوردی نووسیبێت، واتە لە جیاتیی "ي"ی عەرەبی نووسیبێتی "ی".
ئەم جۆرە تێکستانە گەر بکرێتە ئنپووت بۆ بەرنامەیەکی وەک وەرگێری گووگڵ - گووگڵ ترانسلەیشن، ئەوا یەکسەر ئەو بەرنامەیە وشەکە بە عەرەبی تێدەگات، هەربۆیە هەوڵی راستکردنەوەی ناپێویستت بۆ دەدات.

ئەم جۆرە نووسینانە بە زۆری لەلایەن ئەو کەسانەوە دەنووسرێن کە تازە کەوتوونەتە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر یان سمارت فۆن، چونکە زۆرێک لە مەسجەکانی سمارت فۆن بەو شێوە خراپە دەنووسرێن و بەو پێیەش دۆزینەوە و تێگەیشتنیان ئاسان نابێت..

نموونەی سێیەمیش، وەک دووەم وایە، لەوانەیە بە کیبۆرد و فۆنتی فارسی نووسرابێت، هەربۆیە چوکڵەکە لەسەر پیتی یاء دەرنەکەوتووە. لەوانەشە بە کیبۆردی کوردی نووسرابێت و لەجیاتی "ێ" پیتی "یاء" نووسراوە، کە ئەمە زۆرجار لە هەڵەی چاپیشدا روودەدات. بەڵام چ جۆرە یایەکە؟ ئەوەیان نازانین!.

نموونەی چوارەم خراپترین و زەقترینیانە، چونکە وشەکە وەک "هەولێر" دەردەکەوێت! وشەی هەولێر شەش پیتە، بەڵام ئەگەر بەم شێوەیە بنووسرێت دەبێتە هەفت پیت! هۆیەکەشی بزوێنەکەیە، لە راستیدا ئەوە بزوێن نییە و پیتی هایە کە بەهۆی پیتێکی ترەوە لە پیتەکەی دووای خۆی جوودا دەکرێتەوە و وەک بزوێن دەردەکەوێت. ئەو پیتە نادیارە کە پێی دەڵێن ZERO WIDTH NON-JOINER و بەهای یونیکۆدەکەی U+200C، هەروەکو لە خشتەی پیتە کوردییەکاندا نیشاندراوە. ئەگەر ئەم پیتە لە وشەکە دەربهێنرێت یان فیلتەر بکرێت، هەروەکو زۆرێک لە ماشێنی گەڕان و تێکست ڤیوەرەکان[11] دەیکەن، ئەوا وشەکە دەبێتە "هھولێر"! سەرباری ئەمەش ژمارەی پیتەکان هەفتە و بەو پێیەش قەبارەی تێکستەکە گەورەتر دەکات، پروانە وێنەکەی خوارەوە:

[11] Text Viewer




بەڵام ئەگەر بەشێوە ئاساییەکەی بنووسرێت و بزوێن وەک پیتی بزوێن و بە یونیکۆدی 5U+06D بنووسرێت، ئەوا وەک لە وێنەکەی خوارەوەدا دەردەکەوێت ژمارەی پیتەکانی دەبنە شەش و دیارە قەبارەی تێکستەکەش ئاسایی دەبێت.

ئەم کێشەی ZERO WIDTH NON-JOINER لە رێنووسی ئێمەدا زۆر گەورەیە و پاشتر لە بەشی تایبەت بەخۆیدا زۆرتر باسی دەکەم.



## کێشەی پیتی یاء

لەبارەی کێشەی یاءەوە، تکایە سەرنجی ئەو دوو نموونەی بدەن.

| نموونە | تەواو | ناتەواو |
|---|---|---|
| 1 | میتان | میتان، لە سەرەتا و ناوەڕاستی وشەکاندا دەرناکەوتن چ جۆرە پیتێکە. |
| 2 | سلێمانی | سلێماني، لە کۆتایی وشەکاندا دوو خاڵی دەچێتە ژێر و دەردەکەوێت کە ئەمە یائی عەرەبییە. |

نموونەی یەکەم، وەک ئاگری بنکا وایە و دەرناکەوێت، بەڵام لە کاتی گەڕاندا ئاگرەکە دێتە سەر کاکە و هیچت بۆ نادۆزرێتەوە، چونکە ئەو یایە عەرەبییە و یونیکۆدەکەشی U+064A.
نموونەی دووەم، بە ئاسانی دیارە کە یای کوردی نییە، چونکە کەوتووەتە کۆتایی وشەکەوە و دوو خاڵی هاتووەتە ژێر.
باشترین پیت بۆ بەکارهێنانی دەربڕینی یائی کوردی یونیکۆدی U+06CCیە، ئەمە لە هەر شوێنێکی وشەکەدا بێت ئاساییە، چونکە بەشێوەیەکی تۆتۆماتیکی لە سەرەتا و ناوەڕاستی وشەکاندا دەبێتە کورسی و دوو خاڵی دەچێتەژێر، بەڵام لە کۆتاییدا دەبێتە یائی مراوی و خاڵەکان دیارنامێنن.

## کێشەی چەند یائی

ئەمەش لەوانەیە لە کێشە، گەورەتر بێت و هیچی لە کارەساتی بزوێن کەمتر نەبێت، تێرامێنە تۆ دەتەوێت گووگڵی کتێبێک بکەیت بەناوی کۆتاییەکان! چی بنووسیت باشە!

1. کۆتایەکان
2. کۆتاییەکان
3. کۆتاییەکان
4. کۆتاییەکان

من خۆت سەرپشک دەکەم کامەیان دەنووسیت! دیارە من بژاردەی سێیەمم لا راستترە، هەربۆیەشە ئەم سەرباسەم ناونەنا دوو یائی، بەڵکو کردمە چەند یائی.

ئێمە کێشەی یەک یا و دوو یا و سێ یامان زۆرە، کەم کەس هەیە بەتەواوەتی مافی خۆیی پێبدات. لێرەدا سەرنجتان بۆ ئەم دوو نموونەیەی خوارە رادەکێشم بۆ ئەوەی بزانین کە نووسینی یان نەنووسینی یائی دووم چەند ترسناکە.

| نموونە | رستە |
|---|---|
| 1 | براکەی، خۆی کوشت |
| 2 | براکەی، خۆیی کوشت |

وایدانێ، ئەوە رستەیەکی تێکستێکی یاساییە، یان هی لێکۆڵینەوەیەکی بنکەیەکی پۆلیسە، نموونەی یەکەم باسی برای کەسێک دەکرێت کە خۆی خۆی کوشتووە، بەڵام لە نموونەی دووەمدا بەهۆی یائی دووەمەوە، کەسەکە خۆی براکەی خۆیی کوشتووە. بەڵام ئەگەر مەبەستەکە هی دووەم بێت و بە یەک یاء بنووسرێت، دەبێت ئەو تێکستە یاساییە چیی لێبەسەربێت و چ بەهایەکی یاسایی بۆ بمێنێتەوە!.

## کێشەی پیتی واو و پێکەوەبەستنەوەی وشەکان و پیتی ZWNJ[12]

ئەمەش کێشەیەکی گەورەیە بە ئەندازەی کارەساتی بزوێنەکە! لەڕاستیدا ئێمە خۆمان ئەم کێشەیەمان بۆ خۆمان دروستکردووە و هەمووشی دەگەڕێتەوە بۆ هێزکاری زمانی عەرەبی و فارسی بەسەر رێنووسی زمانەکەمانەوە، هەربۆیە ئێمە دێوەزمەی پیتی ZWNJمان هێنایە ناو رێنووسەکەی خۆمانەوە.

---

[12] پانتایی سفری لێکجیاکەرەوە.

ئێمە رۆژانە ملیۆنان لەم پیتە نەبینراوە ناپێویستانە بەکاردێنین و داونلۆدیان دەکەین، بەبێ ئەوەی هیچ بەهایەکی ڕێزمانی و ڕێنووسیی بۆ زمانەکەمان هەبێت.
پێش ئەوەی زۆرتر لەم پیتە ترسناکە بدوێین، سەرنجتان بۆلای ئەم خشتەیەی خوارەوە رادەکێشم:

| کوردی بە **ZWNJ** | کوردی پاش لابردنی **ZWNJ!** | کوردی بێ **ZWNJ** | هەمان واتا |
|---|---|---|---|
| میتانو ئارتین | میتانو ئارتین | میتان و ئارتین | میتان لەگەڵ ئارتین |
| منو تۆ | منو تۆ | من و تۆ | من لەگەڵ تۆ |
| کیاکسارو ئاستیاگ | کیاکسارو ئاستیاگ | کیاکسار و ئاستیاگ | کیاکسار لەگەڵ ئاستیاگ |
| پاروو کەوچک | پاروو کەوچک | پارو و کەوچک | پارو لەگەڵ کەوچک |

| کوردیی لاتینی | عەرەبی | ئینگلیزی |
|---|---|---|
| Mîtan u Artîn | میتان وارتن | Mitan and Artin |
| Min u to | انا وانت | You and me |
| Kiyaksar u Astiyag | کیاکسار واستیاج | Kiyaksar and Astiyag |

پێش ئەوەی بێمە سەر نموونەکانی ئەم خشتەیە، دەمەوێت باسی ئەوە بکەم کە زمانەکەی ئێمە بەو پێیەی بەشێکە لە پۆلی هیندوئەورووپی،

دەبێتە ئێمەش وەک ئەوان ڕێساکانی ڕێزمان و ڕێنووس بەکاربهێنین، با سکریپتی ئارامیش بەکاربهێنین، هەر دەبێت پەیوەست بین بە ڕێساکانی زمان و ڕێنووسی ئەو گروپەوە کە ئێمە بەشێکین لێی.
پێشتر وتم، ئێمە خۆمان ئەم کێشەیەمان بۆ خۆمان دروستکردووە! ئەگینا ئێمە لە بەکارهێنانی سکریپتی ئارامی-عەرەبیدا هیچ پێویستییەکمان بە بەکارهێنانی ZWNJ نییە! بەهیچ جۆرێکیش پێویستمان بە جیاکردنەوەی دوو پیتی ناو وشەیەک نییە!.
نموونەی یەکەمی خشتەکە، دوو ناوی کوردین و کراون بە کۆ، لە کوردیدا بچووکترین وشە "و[13]"ە، هەروەک چۆن لە ئینگلیزیدا "I" واتە من یەک وشەیە. پیتی و لە کوردیدا واتای لەگەڵ یان دەگەڵ دەگەیەنێت، ئیدی بۆچی وەک "و"ی عەرەبی کە پێی دەڵێن "حرف عطف" لە کوردیدا رەفتاری لەگەڵ بکرێت!. ڕاستە پیتی "و" دەکرێت وەک ئامرازی پەیوەندی بەکاربهێنرێت، بەڵام چ پێویست دەکات بلکێنرێت بە وشەکەی پێشییەوە.
لە هەموو ڕێنووسێکدا پاش کۆتایی هەر وشەیەک، جگە لە خاڵبەندی ئەگەر هەر وشەیەکی تری بە دووادا هات، دەبێت پاش بۆشاییەک بێت کە لە زمانی کۆمپیوتەریدا بە سپەیس ناسراوە. ئیتر وشەکە یەک پیت بێت یان بیست دەبێت کێشە چی بێت!.
بەوشێوەیە، ئەگەر پیتی "و" وشە بێت! ئایا بۆچی بە وشەکەی پێشترییەوە بنووسێنرێت و لە هەر یرگەیەکی لەو جۆرەدا پیتێکی نادیاری وەک ZWNJی پێوە بلکێنرێت.
هەندێک وشە هەن بە دوو واو کۆتاییان دێت، بۆ نموونە ئەگەر بگووترێت دوو لەگەڵ سێ، بەپێی ئەم شێوازە دەبێتە "دووو سێ"!، دیارە لە زمانەکەی ئێمەدا لە هیچ وشە و دەستەواژەیەکدا سێ واو بەدوای یەکتریدا نایەت. هەر بۆیە دەبێت بگووترێت دوو و سێ نەک دووو سێ.
ئەمە کێشەیەکیشە بۆ ماشێنی گەڕانەکان، چونکە لە نموونەی یەکەمی میتان و ئارتیندا، ئەگەر بخوازرێت تەنها ئەو تۆمارانە بدۆزرێنەوە کە تەنها میتانیان تێدایە، نادۆزرێنەوە! چۆنکە وشەی میتان یەکسان نییە بە

---

[13] پیتی "چ" لە کوردیدا وشەیشە، چ وشەیەکی ترە بۆ چی؟ زۆرتر ئەم پیتەوشەیە لە ناوچەی هەولێر و دەوروبەری بەکاردێت.

"میتان‌و"!. لەو کاتەدا دەبێت لۆجیکی گەڕانی "دەستپێبکات بە..."[14] بەکاربێت.
دیسانیش ئەمە کێشە دەبێت بۆ هەندێک پراوسەر و تێکست ڤیوەر، کە ئەم پیتە نادیارە فەرامۆش دەکەن و پیتی "و"وەکەی پاش وشەکە بە وشەکەوە دەنووسرێت و دەبێتە "میتانو"! هەروەک لە ئەستوونی دووەمدا پیشاندراوە.
پاشان، ئەگەر رۆژێک تەواوی سکریپتی زمانی کوردی ببێتە لاتینی، ئەوا ناکرێت، دەستەواژەی یەکەم "میتان‌و ئارتین" وەک "Mîtanu Artîn" بنووسرێت.
هەربۆیە دەبێت ئێمە ئەو بڕیارە گرنگە لە ڕێنووسەکەماندا بدەین و هەرچی پیتی نادیاری ZWNJ لە ڕێنووسەکەماندا نەیهێڵین و پیتی "و"یش وەک وشە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت کە هەر بەڕاستیش وایە.
گەر ئەوەمان بۆ بچێتەسەر ئەوا بەئاسانی دەتوانین بەرنامەی کۆنترۆڵکردنی ڕێنووس[15] دروستبکەین.
بۆ ئەم مەبەستەش زۆر گرنگە ئەو تەختەکلیلانەی لەمەودوا دروستدەکرێن ئەم پیتەیان تێدا نەبێت، تاوەکو لەبیر بەکارهێنەرانی ببرێتەوە.

ئەم خشتەیەی خوارەوە بەکارهێنانی ZWNJ دەردەخات لە زمانەکانی فارسی و ئوردوودا
سەرچاوەی خشتەکە - ویکیپیدیا

[14] Starts with...
[15] Spell Checker

| Correct (with ZWNJ) | | | Incorrect | | | Meaning |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Display | Picture | Code | Display | Picture | Code | |
| میخواهم | می‌خواهم | می‌خواهم (rendered from right to left): خواهم‌می | میخواهم | میخواهم | میخواهم | Persian 'I want to' |
| עֲוֹנֹת | עֲוֹנֹת | עֲו‌נֹת (rendered from right to left): נֹת‌עֲו | עֲוֹנֹת | עֲוֹנֹת | עֲונֹת | Old Hebrew 'transgressions' |
| Auflage | Auflage | Auf‌lage | Auflage | Auflage | Auflage | German 'edition' (compound of "auf"+"Lage") |
| Brotzeit | Brotzeit | Brot‌zeit | | Brotzeit | Brotzeit | German (regional) '(kind of) snack' (compound noun "Brot"+"Zeit" = 'bread time'), shown in Fraktur |

لەو خشتەیەدا، سەرنجی وشەی "می‌خواهم"ی فارسی بدەن، کە دوو برگەیە و بە پیتی نادیاری ZWNJ هەردوو برگەی می و خواهم جوداکراوەتەوە. ئەمە لە زۆر شوێندا گوزراوەتەوە بۆ رێنووسی کوردیش. دیارە من باسی ئەوە ناکەم و کێشەم بەوە نییە فارس بۆچی دەنووسێت می‌خواهم و نانووسێت میخواهم!. بەڵام دەبێت لامان کێشە بێت کە وشەکانی وەک "نییە و تێبینی" و زۆریتر یەک وشەن و پێویست ناکات ببنە "نی‌یە و تێ‌بینی"!.
دیارە خوێندنەوەی یائی مراوی لەباری دەروونییەوە درێژترە لە یائی سەر کورسی، لەوانەیە ئەو شێوەی نووسینی "نی‌یە"یە لەوەوە هاتبێت، چونکە دەبێت ئەکسێنت بخرێتە سەر یائی یەکەم.

## کێشەی وو

هەر یەکێک لە ئێمە فرچکمان بە "دارا دوو داری دی"ی مامۆستا باڵدارەوە گرتووە، من ئەو کات زۆر منداڵ بووم نەمدەزانی و بۆم نەدەچووەوە سەریەک بۆچی "دوو" بێت و "دو" نەبێت!.

ئەم کێشەی دوو واوە نازانم ئەگەر ڕێسایەکی روونی لە ڕێنووسەکەماندا هەبێت یان نا، بەڵام ئەمیش وەک ئەوانی تر بوونەتە کێشەی ڕێنووسی دیجیتاڵمان. دیارە من کێشەم نییە تۆ بڵێی خانو یان خانە. بەڵام کێشەیە من بنووسم خانوو و تۆش خانو!.
هەڵبەت ئەم کێشەیە لە کوردیی کرمانجیی لاتینیشدا هەیە و دوو واو بە "û" دەنووسرێت، بەڵام ئەوەی لە کرمانجیی لاتینیدا پێم سەیرە واوی پەیوەندیش هەر بەم دوو واوە دەنووسرێت نە "u"ی ئاسایی!.

لەم خشتەیەی خوارەوەدا کێشەکە باشتر دەبینین:

| نموونە | رستە 1 | رستە 2 |
|---|---|---|
| 1 | خانووەکەی ئێمە لە گەڕەکی زانکۆیە. | خانوەکەی ئێمە لە گەڕەکی زانکۆیە. |
| 2 | خانوەکەی تۆ لە گەڕەکی چوارچرایە؟ | خانووەکەی تۆ لە گەڕەکی چوارچرایە؟ |
| 3 | یەک خانو؛ | یەک خانوو؛ |

لێرەدا، من گفتوگۆی ئەوە ناکەم ئایا خانوو راستە یان خانو، دوو راستە یان دو! بەڵام من وایدادەنێم کە تێکستێکی درێژم لە بەرنامەی مایکرۆسۆفت وۆردا کردووەتەوە و دەمەوێت بگەڕێم بەدوای رستەی یەکەمدا لە نموونەی یەکەم، دیارە گەر بنووسم "خانوەکەی ئێمە لە گەڕەکی زانکۆیە"، هیچ نادۆزمەوە. ناچار دەبم خانو بکەم بە خانوو، تاوەکو شتێکم دەستبکەوێت!
لە نموونەی دووەمدا، تێبینیی گۆڕانکاریی ژمارەی واوەکان بکە کە پێچەوانە بووەتەوە و وایدانێ کە تێکستەکە هەردوو رستەی نموونەی یەک و دوو لەخۆدەگرێت. ئەمجارەیان بەدوای "خانووەکە"دا دەگەڕێم، ئەنجامەکەم تەنها یەک تۆمار دەبێت کە ئەویش "خانووەکەی تۆ لە گەڕەکی چوارچرایە؟". بەڵام رستەی "خانوەکەی تۆ لە گەڕەکی چوارچرایە؟" نادۆزێتەوە چونکە خانوو لەم رستەیەیاندا بە یەک واو نووسراوە!.

هەربۆیە چ کاری من و چ کاری مایکرۆسۆفت ۆردیش گرانتر دەبێت و ناچارم پێی بڵێم تکایە بگەڕێ بەدوای "خانووەکەی ئێمە لە گەڕەکی زانکۆیە" یان "خانوەکەی ئێمە لە گەڕەکی زانکۆیە"، دیارە وشەی یان پرۆسەی گەڕانەکە و ماوەی تایپکردنی منیش گرانتر و زۆرتر دەکات.
هەندێک جاریش بەهۆی شوێنکەوتەی وشەکان یان بەهۆی ئەو کلیلە وشانەی کە دەیاننووسیت، بەخت یاوەرت دەبێت یان بەپێچەوانەوە. لە نموونەی سێدا، گەر بەدوای "یەک خانو"دا بگەڕێیت، ئەوا خۆشبەختیت و هەردوو رستەکەیت بۆ دەدۆزێتەوە، ئەمە ئەگەر بە ماشێنی گەڕانەکەت نەگوتبێت گەڕانی دەقاودەق.
بەڵام ئەگەر بەدوای "یەک خانوو"دا بگەڕێیت ئەوا تەنها ئەوە دەدۆزیتەوە کە داواتکردووە. ئەویش رستەی دووەمە و یەک دانەیە!
من پێموایە کە لە هەموو وشەکاندا تەنها یەک واو بنووسرێت و واز لەو دوو واوە بهێنین، لەم نووسینەدا من نەمتوانی کە پەیرەوی ئەو رایەم بکەم، چونکە ئەم بڕیارە دەبێت لە لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە بدرێت و هەموو ئەو وشانەی بە دوو واون بکرێنە یەک واو و لە کاتی خوێندنەوەدا منداڵان فێری ئەوە بکرێن کە بۆ نموونە ژمارە دوو بە دو بنووسن بەڵام وەک دوو بیخوێننەوە، ئەمە لە زۆر زمانی ئەوروپیدا پەیرەودەکرێت.

## کێشەی "ر" و "ڕ"

دەربارەی "ر" و "ڕ"، زۆر بابەتم لەسەری بینیوە و زۆریش لێرە و لەوێ گفتوگۆم لەسەری کردووە، نەبوونی رێسایەکی تەواو بەتایبەتی بۆ ئەو وشای کە بە "ڕ" دەستپێدەکەن و ئایا باشتر وایە بە "ر" بنووسرێت یان هەر بە "ڕ"، کێشەیەکی تەکنیکیی ترە لە رێنووسەکەماندا.. ئەم کێشەیە بەلەجیاتیدانان دەکرێت ئەو نموونانەی بەشی دوو واوی بەسەردا بچەسپێت، بەتایبەتی کاتێک لە ماشێنی گەڕانەکاندا دەمانەوێت بگەڕێین بەداوی بۆ نموونە "ڕێکار"دا، ئایا "رێکار" بنووسرێت یان "ڕێکار". ئەگەر رێککەوتنی روونمان لەسەری نەبێت ئەوا هەموو ئەو زانیارییانەمان دەستناکەوێت کە خواستمانە، چونکە هەردوو پیتی "ر" و "ڕ" دوو پیتی جیاوازن و خاوەنی دوو بەهای جیاوازی یونیکۆدن. بۆ بینینی بەهاکانیان پروانە لیستی پیتە کوردییەکان و بەها یونیکۆدەکانیان.

## کێشەی خاڵبەندی و پیتەهێماکان

کێشەی خاڵبەندی لە ڕێنووسی کوردیدا چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەی لێوەکراوە. من لێرەدا تەنها ئەو باسانە دەوروژێنم کە پەیوەستیی بە زمانی دیجیتاڵی کوردی و کێشەکانییەوە هەیە.
خاڵبەندی، هەموو ئەو پیتانەن کە بۆ جوانکاری و شێوازی خوێندنەوە و دەربڕین و جیاکردنەوە بەکاردەهێنرێن. بەناوبانگترینیان خاڵ و وێرگوڵە.

لێرەدا لیستی ئەو پیتانە و بەها یونیکۆدییەکانیان بۆ ڕێنووسی کوردی دەخەمەڕوو:

| پیت | ناو | بەهای یونیکۆد |
|---|---|---|
| . | خاڵ | U+002E |
| ، | وێرگوڵ - کۆما | U+060C |
| ؟ | نیشانەی پرسیار | U+061F |
| ! | نیشانەی سەرسوڕمان | U+0021 |
| ( | کردنەوەی کەوانە | U+0028 |
| ) | داخستنی کەوانە | U+0029 |
| % | نیشانەی ڕێژە | U+0025 |
| " | جووتچوکڵە Quotation Mark | U+0022 |
| ' | تاکچوکڵە Apostrophe | U+0027 |

| - | داش | U+002D |
|---|---|---|
| ؛ | کۆما لەسەر خاڵ<br>Semicolon | U+061B |
| : | دوو خاڵ لەسەریەک<br>Colon | U+003A |
| ـ | درێژکەرەوە - تەتویل | **U+0640** |

بەرلە هەر شتێک پیتی درێژکەرەوە کە بە عەرەبی پێی دەگووترێت "تەتویل" و یونیکۆدەکەی لە خشتەکەی سەرەوەدا ئاماژە و هایلایتکراوە، نابێت بەهیچ جۆرێک لە رێنووسی دیجیتاڵی کوردیدا بەکاربهێنرێت. پێویستە ئەو تەختە کلیلانەی کە بۆ رێنووسی کوردی دروستدەکرێن ئەم پیتە لەخۆ نەگرێت. چونکە جگە لە سەرلێتێکدانی ماشێنی گەڕان و زۆرکردنی قەبارەی تێکستەکان لەسەر هارد درایڤەکان، زۆرکردنی داتا ترافیک، هیچ سوودێکی نییە!
ئەم پیتە هەمان پاشماوەی سەردەمی تایپرایتەرە، کاتی خۆی بۆ پرکردنەوە و رێککردنی لای چەپی تێکستەکان بەکاردەهێنرا و ئێستا لاوازترین پرۆگرامی تێکست پرۆسێسینگ دەتوانێت بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەو پرکردنەوەیە بکات و لای چەپی نووسینەکانیش کە پێی دەگووترێت "Justify" رێکبکاتەوە.

پیتەکانی (خاڵ، وێرگوڵ، نیشانەی پرسیار، نیشانەی سەرسوورمان، دووخاڵ لەسەر یەک و کۆما لەسەر خاڵ)، بەپێی هەموو ستاندارده جیهانییەکان دەبێت بنووسێت بە وشەکەی پێشییەوە و نابێت بەهیچ جۆرێک پیتی بۆشایی لە نێوانیاندا بێت!. بەڵام بەداخەوە لە نووسینە کوردییەکاندا زۆر ئەمە پەیرەو ناکرێت. هەربۆیە زۆرجار بەهۆی ئەو بۆشاییەی نێوان وشە و ئەم پیتانەوە، سەرەتای دێری داهاتوو بە یەکێک لەم پیتانە دەستپێدەکەن!. هیوادارم ئەمە وەک رێسایەک لەبەرچاو بگیرێت.
پیتی نیشانەی رێژە، هەریەک و لە لایەک دەینووسێت، 20% راستە یان 20%! ئەمەش دەبێت رێسایەک رێکبخات. ئێمە کە بە سکریپتی

عەرەبی بنووسین و ئەویش لە راستەوە بۆ چەپ بێت، ئیدی بۆچی نەنووسین %20، بەواتای لەسەدا بیست، نەک بیست لەسەدا!

کەوانەکان، کێشەیەکی گەورەن لە رێنووسی کوردیدا، هەندێک نووسینم بەرچاو کەوتووە، وامزانیوە سەیری هاوکێشەیەکی کیمیایی یان بیردۆزێکی ماتماتیکی دەکەم! بەکارهێنانی کەوانە ماتماتیکییەکانی وەک {}[]<> دەبێت لە نووسینە نا زانستییەکاندا نەمێنن، چونکە ئەمانە واتای دیاریکراویان هەیە و هیچ پەیوەندییەکی بە نووسینێکی ئاساییەوە نییە.

کەوانەکانی ()، یان دوو چوکڵە و یەک چوکڵە، ستانداردێکی جیهانییە بۆ هەر تێکستێکی ئاسایی و دەبێت ئێمەش واهی بکەین. لە کێشەی ئەم کەوانانەدا دیسان کێشەی بۆشایی دێتە پێشەوە هەندێک جار کەوانەی کراوە دەکەوێتە کۆتایی رستەوە و ئەوەشی کە دەبێت لە کەوانەکەدا بێت، دەکەوێتە رستەی دادێوە! یان کەوانەی داخراو بەهۆی بۆشاییەکەوە دەکەوێتە رستەی دادێوە! و لەم خشتەیەی داهاتوودا چەند نموونەیەک و باش و خراپەکانیان دەخەمە روو.

| هەڵە | راست |
|---|---|
| وتی {من نایەم} | وتی (من نایەم) |
| وتی { من نایەم} | وتی "من نایەم" |
| وتی {من نایەم } | وتی 'من نایەم' |
| وتی { من نایەم } | |
| وتی [من نایەم] | |
| وتی [ من نایەم] | |
| وتی [من نایەم ] | |
| وتی [ من نایەم ] | |

| | |
|---|---|
| وتی ( من نایەم) | |
| وتی (من نایەم ) | |
| وتی ( من نایەم ) | |
| وتی " من نایەم" | |
| وتی "من نایەم " | |
| وتی " من نایەم " | |
| وتی ' من نایەم' | |
| وتی 'من نایەم ' | |
| وتی ' من نایەم ' | |
| وتی < من نایەم> | |
| وتی <من نایەم > | |
| وتی < من نایەم > | |
| وتی <من نایەم> | |
| هەندێک کەوانەی تری سەیر سەیری تریش لە تێکستە کوردییەکاندا دەبینم کە لەوانەیە پەیوەندییان بە تێکستی ئایینییەوە بێت و پێویستە لە ڕێنووسی خۆماندا نەیانهێڵین. | |

# Search Engineماشێنی گەڕان -

ماشێنی گەڕان، بەرنامە یان سکریپتێکی بەرنامەوانییە، بەهۆیەوە بەکاربەران کلیلە وشەیەک یان زۆرتر دەدەنە ماشێنەکە و ماشێنەکەش لەو فایل یان داتابەیسانەی کە پێیەوە پەیوەستکراوە، دەگەڕێت بەدوای کلیلە وشەکەدا و "ئەگەر" ئەنجامێکی دۆزییەوە، ئەوا بەشێوەیەک لە شێوەکانی پیشانی بەکاربەری دەدات.
زۆرینەی ئەو نموونانەی لەسەرەوە باسکران پەیوەندییان بەم گەڕان و ماشێنی گەڕانەوە هەیە. گرنگە بزانیت ئەو فایل یان داتابەیسەی لە پشتی ماشێنی گەڕانەکەوە هەیە، بە چ شێوازێک نووسراوە، هەروەها لەویش گرنگتر ئەوەیە کە بزانیت چی دەکەیتە ئنپوت - Input بۆ ماشێنەکە، تاوەکو ئەوەی مەبەستە بیدۆزیتەوە. هەربۆیە ئەگەر وەک پێشتر باسکرا پیتی کافەکانی ناو داتاکانی پشتی ماشێنەکە بە "ک" نووسرابوو و ئەوانەی تۆش بە "ك"! ئەوا دڵنیابە ئەنجامێکی باشت نابێت، مەگەر ئەوەی ماشێنەکەی دروستکردووە هەندێک لۆجیکی لێکچوونی ئەو پیتانەی بۆ دروستکردبێتی، تاوەکو یارمەتیت بدات لە دۆزینەوەی ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێیت.

لێرەدا زۆرتر دەچمە بواری تەکنیکەوە و کەمێک باسی زمانی بەرنامەوانیی گەڕان دەکەم کە خۆی لە (T SQL)دا دەبینێتەوە. دڵنیام سوودێکی دەبێت بۆ بەرنامەوانانی کورد تاوەکو ماشێنی گەڕانەکانیان باشتر دروستبکەن. تکام ئەوەیە ئەگەر زۆر سەروبەرت لەگەڵ ماددەی تەکنیکیدا نییە، واز لەم بەشە بهێنە بۆ تەکنیکوانان و بچۆرە سەر بەشی داهاتوو.
زۆرترینی ئەو ماشێنی گەڕانانەی کە پەیوەستن بە داتابەیسەکانەوە زمانی تی - ئێس. کیو. ئێڵ بەکاردێنن، پرۆگرامەری سەرکەوتوو، دەبێت کارێکی وا بکات لە بەرنامەکەیدا، کە کەسێک لە کلیلە وشەکەیدا پیتی "ك" یان "ک"ی بەکارهێنا، ئەو لە پشتی پەردەوە و بەبێ ئەوەی

بەکارهێنی ئاگادار بێت ئەو وشانە بگۆڕێتە سەر ئەو شێوازەی کە فایلەکان یان داتابەیسەکەی پێ نووسراوە.

لەخوارەوە هەندێک پێشنیاز و چارەسەر دەخەمە روو بۆ بەرنامەوانانی کورد تاوەکو کوێریی گەڕانەکانیان بەو شێوەیە بنووسن و لەگەڵ یونیکۆدی سەردەمدا بیگونجێنن.

| پیت | کلیلە وشە | T-SQL Query |
|---|---|---|
| ک، ك | "ک"ورد<br>"ك"ورد | Select * From TableName Where FieldName Like '%[ک,ك]ورد%'<br><br>لەم کوێرییەدا بەکارهێنی وشەی کورد بەهەر جۆرێک کاف بنووسێت هیچ کێشەیەک نایێت و ماشێنەکە سەیری هەموو ئەو وشانە دەکات کە بەهەردوو کافەکە نووسراون و پیشانی بەکارهێنی دەدات. |
| ا، أ، آ، هتد | میتان<br>میتآن<br>میتأن<br>مێتان | Select * From TableName Where FieldName Like '%م[ی,ي,ێ]ت[ا,آ,أ]ن'%<br><br>ئەم نموونەیە لەوەی پێشوو ئاڵۆزترە، بەکارهێنی هەر جۆرە یایەک یان ئەلفێک بەکاربهێنێت بۆ گەڕان، کێشە نایێت و کوێرییەکە وشەی میتان دەدۆزێتەوە. دیارە ئەمە دەتوانرێت زۆر لەوە ئاڵۆزتر و زیرەکتر بکرێت، بۆ نموونە ئەگەر بەکارهێنی بەدوای "ئارتین"دا گەڕا، دەکرێت ئەلف و راء و یاء، بەجیا بخرێتە ناو کەوانە لاکێشەییەکەوە و گریمانەکانی پێبدرێن:<br>• [ی،ي،ێ]<br>• [ا،أ،آ، هتد]<br>• [ر،ڕ] |

| بزوێن<br>ە<br>ة<br>هـ | هەولێر | • [ە،ة]<br>• لابردنی ZWNJ و پاشان گۆڕینی هـهولێر بۆ هەولێر<br>• یان گۆڕینی هە ولێر بۆ هەولێر و پاشان بکرێتە ئنپوت بۆ کوێرییەکە.<br>بەو جۆرە هەولێر هەر چۆنێک نووسرابێت دەدۆزرێتەوە. |
|---|---|---|

ئەم لیستەیە خوارەوە زۆرینەی ئەو گریمانانەیە کە پێویستە بۆ هەر ماشێنێکی گەڕانی کوردی بەکاربهێنرێت و لەگەڵ کوێرییەکاندا تێکهەڵکێشبکرێت، تاوەکو بەکاربەر هیچ ئەرکێک نەکێشێت لە نووسینی کلیلە وشەکاندا و بەئاسانی ئەوەی دەیەوێت بیدۆزێتەوە:

| پیت | گریمانەکان |
|---|---|
| ک | [ك،ک] |
| ك | [ك،ک] |
| ە | [ە،ة] |
| ة | [ە،ة] |
| ی | [ی،ي،ێ] |
| ي | [ی،ي،ێ] |
| ێ | [ی،ي،ێ] |
| ا | [ا،أ،آ،إ] |
| أ | [ا،أ،آ،إ] |
| آ | [ا،أ،آ،إ] |
| إ | [ا،أ،آ،إ] |

| ر | [ر،ڕ] |
|---|---|
| ڕ | [ر،ڕ] |
| و | [و،ۆ،ۊ] |
| ۆ | [و،ۆ،ۊ] |
| ۊ | [و،ۆ،ۊ] |
| ل | [ل،ڵ] |
| ڵ | [ل،ڵ] |
| ب | [ب،پ] بەپێی پێویست |
| پ | [ب،پ] بەپێی پێویست |
| ف | [ف،ڤ] بەپێی پێویست |
| ڤ | [ف،ڤ] بەپێی پێویست |
| ٠ | [0،٠،۰] بۆ چارەسەرکردنی ژمارەی فارسی و هندی و عەرەبییەکان |
| ۰ | [0،٠،۰] |
| 0 | [0،٠،۰] |
| ١ | [1,١,۱] |
| ۱ | [1,١,۱] |
| 1 | [1,١,۱] |
| ٢ | [2,٢,۲] |
| ۲ | [2,٢,۲] |

| [٢,۲,2] | 2 |
| --- | --- |
| [٣,۳,3] | ۳ |
| [٣,۳,3] | ٣ |
| [٣,۳,3] | 3 |
| [٤,۴,4] | ۴ |
| [٤,۴,4] | ٤ |
| [٤,۴,4] | 4 |
| [٥,۵,5] | ۵ |
| [٥,۵,5] | ٥ |
| [٥,۵,5] | 5 |
| [٦,۶,6] | ۶ |
| [٦,۶,6] | ٦ |
| [٦,۶,6] | 6 |
| [٧,۷,7] | ۷ |
| [٧,۷,7] | ٧ |
| [٧,۷,7] | 7 |
| [٨,۸,8] | ۸ |
| [٨,۸,8] | ٨ |
| [٨,۸,8] | 8 |
| [٩,۹,9] | ٩ |

| | |
|---|---|
| [٩,٩,9] | ٩ |
| [٩,٩,9] | 9 |
| [e,ê,è,é,ë] | e |
| [e,ê,è,é,ë] | ê |
| [e,ê,è,é,ë] | è |
| [e,ê,è,é,ë] | é |
| [e,ê,è,é,ë] | ë |
| [i,î,ì,í,ï,i] | i |
| [i,î,ì,í,ï,i] | î |
| [i,î,ì,í,ï,i] | ì |
| [i,î,ì,í,ï,i] | í |
| [i,î,ì,í,ï,i] | ï |
| [i,î,ì,í,ï,i] | i |
| [ü,ù,ú,û,u] | ü |
| [ü,ù,ú,û,u] | ù |
| [ü,ù,ú,û,u] | ú |
| [ü,ù,ú,û,u] | û |
| [ü,ù,ú,û,u] | u |
| [ò,ó,ô,ö,o] | ò |
| [ò,ó,ô,ö,o] | ó |

| | |
|---|---|
| [ò,ó,ô,ö,o] | ô |
| [ò,ó,ô,ö,o] | ö |
| [ò,ó,ô,ö,o] | o |
| [c,ć,ĉ,ċ,č,ç] | c |
| [c,ć,ĉ,ċ,č,ç] | ć |
| [c,ć,ĉ,ċ,č,ç] | ĉ |
| [c,ć,ĉ,ċ,č,ç] | ċ |
| [c,ć,ĉ,ċ,č,ç] | č |
| [c,ć,ĉ,ċ,č,ç] | ç |
| [s,ś,ŝ,ş,š] | s |
| [s,ś,ŝ,ş,š] | ś |
| [s,ś,ŝ,ş,š] | ŝ |
| [s,ś,ŝ,ş,š] | ş |
| [s,ś,ŝ,ş,š] | š |
| [g,ĝ,ğ,ġ,ģ] | g |
| [g,ĝ,ğ,ġ,ģ] | ĝ |
| [g,ĝ,ğ,ġ,ģ] | ğ |
| [g,ĝ,ğ,ġ,ģ] | ġ |
| [g,ĝ,ğ,ġ,ģ] | ģ |

ئەو خشتەیە دەتوانرێت زۆرتر درێژ بکرێتەوە و هەموو گریمانەکانی پیتەکانی بۆ زۆرتر بکرێت، بەڵام دیارە لۆجیکەکە هەر یەکێکە و ئەوەی کە کوێرییەکە دەیکات گۆڕینی پیتەکانە بۆ گریمانەکان.

ئەمەی خوارەوە کۆدی ئامادەکردنی کلیلە وشەی بەکاربەرە لە ماڵپەڕی کوردیپێدیادا، پێش ئەوەی بنێردرێت بۆ ماشێنی گەڕانەکە:

تێبینی:

1. ئنپوت، ڤاریابڵە بۆ کلیلە وشە.
2. ریزەڵت، ڤاریابڵە بۆ ئەنجامی ئامادەکردنەکە.

```
for (int i = 0; i < input.Length; i++)
        {
        switch (input.Substring(i, 1))
         {
                case "ک": { result += "[ك,ک]"; break; }
                case "ك": { result += "[ك,ک]"; break; }
                case "ی": { result += "[ێ,ی,ي]"; break; }
                case "ي": { result += "[ێ,ی,ي]"; break; }
                case "ێ": { result += "[ێ,ی,ي]"; break; }
                case "ه": { result += "[ه,ة]"; break; }
                case "ة": { result += "[ه,ة]"; break; }
                case "ا": { result += "[أ,آ,إ,ا]"; break; }
                case "أ": { result += "[أ,آ,إ,ا]"; break; }
                case "آ": { result += "[أ,آ,إ,ا]"; break; }
                case "إ": { result += "[أ,آ,إ,ا]"; break; }
                case "ر": { result += "[ڕ,ر]"; break; }
                case "ڕ": { result += "[ڕ,ر]"; break; }
                case "و": { result += "[و,ؤ,ۆ]"; break; }
                case "ۆ": { result += "[و,ؤ,ۆ]"; break; }
                case "ؤ": { result += "[و,ؤ,ۆ]"; break; }
                case "ل": { result += "[ل,ڵ]"; break; }
```

```
case "ڵ": { result += "[ل,ڵ]"; break; }
case "د": { result += "[د,ذ]"; break; }
case "ذ": { result += "[د,ذ]"; break; }
case "ب": { result += "[ب,پ]"; break; }
case "پ": { result += "[ب,پ]"; break; }
case "ت": { result += "[ت,ث]"; break; }
case "ث": { result += "[ت,ث]"; break; }
case "e": { result += "[e,ê,è,é,ë]"; break; }
case "ê": { result += "[e,ê,è,é,ë]"; break; }
case "è": { result += "[e,ê,è,é,ë]"; break; }
case "é": { result += "[e,ê,è,é,ë]"; break; }
case "ë": { result += "[e,ê,è,é,ë]"; break; }
case "i": { result += "[i,î,ì,í,ï,i]"; break; }
case "î": { result += "[i,î,ì,í,ï,i]"; break; }
case "ì": { result += "[i,î,ì,í,ï,i]"; break; }
case "í": { result += "[i,î,ì,í,ï,i]"; break; }
case "ï": { result += "[i,î,ì,í,ï,i]"; break; }
case "i": { result += "[i,î,ì,í,ï,i]"; break; }
case "u": { result += "[ü,ù,ú,û,u]"; break; }
case "ü": { result += "[ü,ù,ú,û,u]"; break; }
case "ù": { result += "[ü,ù,ú,û,u]"; break; }
case "ú": { result += "[ü,ù,ú,û,u]"; break; }
case "û": { result += "[ü,ù,ú,û,u]"; break; }
case "o": { result += "[ò,ó,ô,ö,o]"; break; }
case "ò": { result += "[ò,ó,ô,ö,o]"; break; }
case "ó": { result += "[ò,ó,ô,ö,o]"; break; }
case "ô": { result += "[ò,ó,ô,ö,o]"; break; }
case "ö": { result += "[ò,ó,ô,ö,o]"; break; }
case "c": { result += "[c,ć,ĉ,ċ,č,ç]"; break; }
case "ć": { result += "[c,ć,ĉ,ċ,č,ç]"; break; }
case "ĉ": { result += "[c,ć,ĉ,ċ,č,ç]"; break; }
case "ċ": { result += "[c,ć,ĉ,ċ,č,ç]"; break; }
```

```
case "č": { result += "[c,ć,ĉ,ċ,č,ç]"; break; }
case "ç": { result += "[c,ć,ĉ,ċ,č,ç]"; break; }
case "s": { result += "[s,ś,ŝ,ş,š]"; break; }
case "ś": { result += "[s,ś,ŝ,ş,š]"; break; }
case "ŝ": { result += "[s,ś,ŝ,ş,š]"; break; }
case "ş": { result += "[s,ś,ŝ,ş,š]"; break; }
case "š": { result += "[s,ś,ŝ,ş,š]"; break; }
case "g": { result += "[g,ĝ,ğ,ġ,ǵ]"; break; }
case "ĝ": { result += "[g,ĝ,ğ,ġ,ǵ]"; break; }
case "ğ": { result += "[g,ĝ,ğ,ġ,ǵ]"; break; }
case "ġ": { result += "[g,ĝ,ğ,ġ,ǵ]"; break; }
case "ǵ": { result += "[g,ĝ,ğ,ġ,ǵ]"; break; }
case "0": { result += "[0,۰,٠]"; break; }
case "۰": { result += "[0,۰,٠]"; break; }
case "٠": { result += "[0,۰,٠]"; break; }
case "1": { result += "[1,۱,١]"; break; }
case "۱": { result += "[1,۱,١]"; break; }
case "١": { result += "[1,۱,١]"; break; }
case "2": { result += "[2,۲,٢]"; break; }
case "۲": { result += "[2,۲,٢]"; break; }
case "٢": { result += "[2,۲,٢]"; break; }
case "3": { result += "[3,۳,٣]"; break; }
case "۳": { result += "[3,۳,٣]"; break; }
case "٣": { result += "[3,۳,٣]"; break; }
case "4": { result += "[4,۴,٤]"; break; }
case "۴": { result += "[4,۴,٤]"; break; }
case "٤": { result += "[4,۴,٤]"; break; }
case "5": { result += "[5,۵,٥]"; break; }
case "۵": { result += "[5,۵,٥]"; break; }
case "٥": { result += "[5,۵,٥]"; break; }
case "6": { result += "[6,۶,٦]"; break; }
case "۶": { result += "[6,۶,٦]"; break; }
```

```
                    case "٦": { result += "[6,۶,٦]"; break; }
                    case "7": { result += "[7,۷,٧]"; break; }
                    case "۷": { result += "[7,۷,٧]"; break; }
                    case "٧": { result += "[7,۷,٧]"; break; }
                    case "8": { result += "[8,۸,٨]"; break; }
                    case "۸": { result += "[8,۸,٨]"; break; }
                    case "٨": { result += "[8,۸,٨]"; break; }
                    case "9": { result += "[9,۹,٩]"; break; }
                    case "۹": { result += "[9,۹,٩]"; break; }
                    case "٩": { result += "[9,۹,٩]"; break; }
                    default:
                              { result += input.Substring(i, 1); break; }
          }
}
```

ئەگەر یەکەمین نموونەکەی ئەم نووسینە بکەینە ئنپوت بۆ ئەم کۆدە، سەرئەنجامەکانمان بەم شێوەیە دەستدەکەوێت:

| ئنپوت - کلیلە وشە | ریزەڵت - ئەنجام |
|---|---|
| کورد و کوردستان | [ک,ك][ۆ,ۇ,و][ڕ,ر][ذ,د] [ۆ,ۇ,و]<br>[ک,ك][ۆ,ۇ,و][ڕ,ر][ذ,د]س[ث,ت][<br>ا,إ,آ,أ]ن |
| محەمەد ئەمین زەکی بەگ | مح[ة,ه]م[ة,ه][ذ,د]<br>ئ[ة,ه]م[ي,ى,ێ]ن<br>ز[ة,ه][ک,ك][ي,ى,ێ]<br>[پ,ب][ة,ه]گ |

ئیدی کێشە نابێت بەهارهێن بە چ شێوەیەک کلیلە وشەکەی دەنووسێت، تەنها کێشەی ئەمە ئەوەیە کە گەڕانەکە دەقاودەق نابێت. ئەویش بەپێی بژاردەی پرۆگرامەکە، دەتوانێت ئەو بژاردەیەش بداتە بەکارهێن، ئایا گەڕانەکە دەقاودەق بێت یان نا.

# گەڕانی ناوەڕۆک و پڕۆسەی ئۆ. سی. ئاڕ. - OCR

دیارە هەموو ئەو زانیارییانەی کە میللەتانی تر و ئێمە هەمانە، هەموویان دیجیتاڵ نین. بەشێکی زۆری زانیارییەکان لەسەر کاغەزن، یان دیجیتاڵ بوون و خراونەتە سەر کاغەز و فایلی دیجیتاڵەکانیان نەماون. ئەو لاپەڕانە دەبێت بکرێنە فایلی دیجیتاڵ، مێتاداتای پێویستی وەک سەرباس، پێناس، پۆل و پۆلی لاوەکیی پێوە پەیوەست بکرێن.
پاش پیادەکردنی ئەوانە، هێشتا ناتوانین بە ئاسانی فایلێک بدۆزینەوە، مەگەر بۆ هەر فایلێک دەیان کلیلە وشەی پێویستی پێوە بلکێنین. ئەمەش کارێکی ئەستەم دەبێت بەتایبەتی ئەگەر ژمارەی فایلەکان لە چەند ملیۆنێک تێپەڕی کرد.
هەربۆیە لێرەدا پرۆسەی ئۆ سی ئاڕ زۆر گرنگ دەبێت کە ناوەڕۆکی ئەو فایلە سکێنکراوانە کە بوونەتە وێنە، بگۆردرێن بۆ تێکست.
ئۆ. سی. ئاڕ. OCR کوورتکراوەی Optical Character Recognition، واتا، ناسینەوە و لەبەرگرتنەوەی پیتەکان، تەکنیکێکە بۆ گۆڕینی وێنە و بابەتی سکێنکراو بۆ داتا، تاوەکو بەهۆیەوە بتوانرێت بەدوای کلیلە وشەیەکدا بگەڕێیت و بیدۆزیتەوە.
باشی و کوالیتیی سەرئەنجامی ئۆ. سی. ئاڕ. دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆ، یەکەمیان کوالیتیی وێنەکە، یان تێکستەکەی سەر کاغەزەکە، دووەمیان ئەو لۆجیکەی کە وێنەکەی پێدەکرێت بە تێکست. هەر بەو پێیە، ئەو تێکستەی کە لە دۆکومێنتێکی کۆنی چرچ و کاڵەوە دەستمان دەکەوێت، وەک ئەوە نییە کە دۆکومێنتەکە باش پارێزرابێت و ڕەنگ و پیتەکانی بەباشی دیاربن.
من تاوەکو ئێستا ئەنجینێکی ئۆ. سی. ئاڕ.ی تایبەت بە کوردیی سۆرانیم نەبینیوە. ئەوانەی کە هەن تایبەتن بە زمانەکانی عەرەبی، فارسی و ئوردو. دیارە ئەو تێکستەشی لەو ئەنجینانە دەستمان دەکەون، کوالیتیی لە باری ڕێزمان و ڕێنووسەوە باش نابێت، چونکە ئەو ئەنجینانە تایبەتن بەو زمانانەوە و لۆجیکی ڕێزمان و ڕێنووسی ئەو زمانانەی تێدا تێهەڵکێشکراوە. بۆ نموونە ئەگەر لەسەر وێنەکە نووسرابوو "هەموو" و ئۆ. سی. ئاڕ.ەکە عەرەبی بوو، ئەوا زۆر ئاساییە لە جیاتیی هەمووی کوردی

"هةمو"ت بۆ دروستببێت یان ببێته "حمو". واته دیسان دەکەوینەوە قەیرانی رێنووس و کێشەی گەڕانی زۆرمان دەبێت لە فایلەکاندا.
بریا کۆلیژە تایبەتمەندەکانی زانکۆکانی کوردستان لەم کێشەیەیان دەڕوانی و ئۆ. سی. ئاڕ. ئەنجنێکی تایبەت بە زمانی کوردی و پیتی ئارامییان دادەنا، تاوەکو بتوانین ئەوەی لەسەر کاغەز هەمانە، بیکەین بە سفر و یەک و بەهۆیەوە بە ئاسانی ئەوەی دەمانەوێت بیدۆزینەوە.

# چەند پێشنیازێک

## ناوە عەرەبی و فارسییەکان

| ناوەکە بە زمانە ڕەسەنەکەی | نموونەی نووسینەکان | پێشنیاز |
| --- | --- | --- |
| محمد | محمد، موحەمەد، موحەممەد، محەممەد، ، محەمەد، حەمە... | محەمەد |
| صبرية | سەبری، سەبریە، سەبرییە | سەبرییە |
| علي | على، علي، عەلی... | عەلی |
| عمر | عمر، عومەر، ئۆمەر، هۆمەر... | عومەر یان هۆمەر یان ئۆمەر |
| عبدالله | عەبدولا، عەبدوڵڵا، عبدالله | عەبدوڵڵا، سەعدوڵڵا، فەتحوڵڵا، حەبیبوڵڵا... |
| محمود | مەحموود، مەحمود، محمود... | مەحمود |
| مسعود | مسعود، مەسعوود | مەسعود |
| طاهر | تایەر، تایر، تاهیر... | تاهیر |
| ظاهر | زایر، زایەر، زاهیر... | زاهیر |
| حسين | حوسێن، حسێن | حسێن |

| محسن | محسین، موحسن | موحسین |
| --- | --- | --- |
| عەباس | | عەباس یان هەباس |
| عبدالرحمن | عەبدلڕەحمان، ئەورەحمان | عەبدولڕەحمان، عەبدولکەریم، عەبدولفەتاح |
| نجم الدین | نەجمەددین | نەجمەدین |
| علاء الدین | عەلائەدین، عەلائودین، عەلائوددین... | عەلادین |
| حسن‌پور | حسن‌پوور، حەسەن پوور، حەسەنپور، حەسەنپوور،... | حەسەنپور، بەهەمان شێوەی حەسەنۆڤ لە رووسیدا، واتە ببنە یەک وشە |
| حسن‌زادە | حسن‌زادە، حەسەن زادە، حەسەنزادە | حەسەنزادە، بەهەمان شێوەی حەسەنۆڤ لە رووسیدا، واتە ببنە یەک وشە |
| مصطفی | مصطفی، موستەفا، مستەفا | مستەفا |
| رؤوف | رەوف، رەووف، رەئوف | رەئوف |
| توفیق | تەوفیق، تۆفیق | تۆفیق |
| خالد | خالد، خالید | خالید |
| ماجد | ماجد، ماجید | ماجید |
| احسان | ئحسان، ئیحسان | ئیحسان |

| فاطمة | فاتمە، تاتیمە | فاتیمە |
| --- | --- | --- |
| عائشة | عایشە، ئایشە، ئایشێ | ئایشێ |
| مقداد | مقداد | میقداد |
| حەمە ئەمین | | حەمەئەمین |
| خضر | خزر، خدر | خدر |
| ابراهیم | برایم، ئیبراهیم | ئیبراهیم |
| اسماعیل | سمایل، ئیسماعیل | ئیسماعیل |
| عصمت | | عیسمەت |
| سلیمان | سولەیمان، سلەمان، سڵێمان | سڵێمان |
| احمد | | ئەحمەد |
| | | |

ئەو لیستەیەی سەرەوە لە چاپی داهاتووی ئەم نووسینەدا باشتر دەکرێت.

لەباسی ناوەکاندا، بەتایبەتی عەرەبییەکان، دەبێت ئاماژە بۆ نووسەرە ئیسلامییەکان بکەم کە هەرچی ناوی عەرەبییە بە رێنووسە عەرەبییەکەی دەینووسن و رێنووسەکەمانی کردووەتە چێشتی مجێور!
ئەو کێشانە دەبێت رێسایەکی روونی بۆ دابنرێت و کەس بەوشێوانە نەنووسێت.
پێشنیاز دەکەم جگە لە پیتە هەورامییەکانی وەک "ث" و "ذ"، هەرچی پیتەکانی "ظ، ض، ص و ط" هەیە لەسەر کیبۆردە کوردییەکان نەمێنن، تاوەکو تایپکەر لەجیاتیی "ص"اڵح بنووسێت ساڵح. هەرکاتێکیش ویستی

هەر ئەو پیتانە بەکاربهێنێت، ئەوا دەتوانێت بە کلیکێک کیبۆردەکەی بکاتە عەرەبی.

## ژمارەکان

ژمارەکان باشتر وایە عەرەبییەکان بەکاربهێنرێن و واز لە ژمارە هندییەکان بهێنرێت، ژمارە عەرەبییەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان لە هەموو دنیادا بووەتە زمانی کۆمپیوتەری. کێشەیەکی تری بەکارهێنانی ژمارە هندییەکان، لەوانەیە لەگەڵ فارسییەکاندا تێکەڵ بکرێن، بۆ نموونە لە عەرەبی ئێستا و فارسیدا، پیتی یەک بە رووخساری (١) دەنووسرێت، بەڵام لە راستیدا ئەم دووانە لەو دوو زمانەدا ئەگەرچی لەیەک دەچن بەڵام خاوەنی دوو بەهای یونیکۆدی جوودان! لە عەرەبیدا U+0660 و لە فارسیدا U+06F0ە. ژمارەکانی تریش لە یەکەوە تا نۆ بەو شێوەیە جیاوازن و بەها یونیکۆدییەکانیان دەگۆردرێت.

لەم لیستەیەی خوارەوەدا ژمارە هندی-عەرەبی و فارسییەکان پیشاندەدرێت:

| هندی | یونیکۆدەکەی | فارسی | یونیکۆدەکەی |
|---|---|---|---|
| ٠ | U+0660 | ۰ | U+06F0 |
| ١ | U+0661 | ۱ | U+06F1 |
| ٢ | U+0662 | ۲ | U+06F2 |
| ٣ | U+0663 | ۳ | U+06F3 |
| ٤ | U+0664 | ۴ | U+06F4 |
| ٥ | U+0665 | ۵ | U+06F5 |
| ٦ | U+0666 | ۶ | U+06F6 |

| ٧ | U+0667 | ۷ | U+06F7 |
|---|---|---|---|
| ٨ | U+0668 | ۸ | U+06F8 |
| ٩ | U+0669 | ۹ | U+06F9 |

لەو خشتەیەی سەرەوەدا بێجگە لە ژمارەکانی (4، 5 و 6) کە هایلایتکراون و لەیەکتری جوودان لە هەردوو زمانەکەدا، کەچی ئەوانی تر وەک یەکتر دەردەکەون، بەڵام دیارە بەهای یونیکۆدیان جوودایە و تووشی کێشەمان دەکەن لە کاتی گەڕان و دروستکردنی ئندێکسدا.

هەربۆیە نووسینی ژمارە و ڕێکەوتەکان بە عەرەبی، فارسییەکان نادۆزێتەوە و پێچەوانەکەشی ڕاستە. دەبێت خۆمان لەو کێشەیە رزگار بکەین و ئەم خشتەیەی خوارەوە بەکاربهێنین. ئەگەرنا، ئەوا دەبێت لە کوێرییەکانماندا گریمانەی هەر سێ جۆری ژمارەکانمان تێهەڵکێش بکەین.

| ژمارەی عەرەبی | ناو | بەهای یونیکۆد |
|---|---|---|
| 0 | سفر - هیچ | U+0030 |
| 1 | یەک | U+0031 |
| 2 | دوو | U+0032 |
| 3 | سێ | U+0033 |
| 4 | چوار -چار | U+0034 |
| 5 | پێنج | U+0035 |
| 6 | شەش | U+0036 |
| 7 | هەفت - حەوت | U+0037 |

| 8 | هەشت | U+0038 |
|---|---|---|
| 9 | نۆ | U+0039 |

لێرەدا دەبێت ئەوە بڵێم کە بەداخەوە زۆرینەی تەختە کلیلە کوردییەکان، ژمارەکانیان هندییە و دەبنە کێشەی گەورە بۆمان. بەهیوای ئەوەی لە تەختە کلیلەکانی داهاتوودا ئەو ژمارانە ببنە ئەوەی کە پێی دەگووترێت دیجیتاڵ و لە رەسەندا عەرەبین.

## رێکەوتەکان

نووسینی رێکەوتەکانیش دەبێت لەبەرچاو بگیرێت! بۆ نموونە من بمەوێت لەسەر گووگڵ بۆ تێکستێکی کوردی بگەڕێم کە باسی نەورۆی 1979 بکات، دەبێت چی بنووسم! ئەمە هەندێک لەو گریمانانەیە:

- 21/3/79
- 21/03/79
- 21/3/1979
- 21/03/1979
- 21.3.79
- 21.03.79
- 21-3-79
- 21-03-79
- 21-03-1979
- دەتوانرێت دەیانی تر لەم جۆرە رێکەوتانە بئافرێنرێت...

ئەمە کێشەیەکی گەورەیە هاوزمانانم، من زۆرجار کە نووسراوێکی فەرمیی باشووری کوردستان دەبینم دەبینم هیچ جارێک نەمدیوە رێسایەک بەکاربهێنرێت لە نووسینی رێکەوتەکاندا، تەنانەت بەهەڵە بە رێکەوتیش دەڵێین "بەروار"!.

نووسراوم بینیوە، ڕێکەوتی سێ کەڵێندەری لەسەر بووە، کوردی!، هیجری و گریگۆری! یان ئەوەی کە پێی دەڵێین زایینی.

بەڵام ئەگەر بمەوێت لە تێکستێکی هۆڵەندیدا بۆ هەمان ڕێکەوت بگەڕێم، ئەوا بێ دوودڵی یەکسەر دەنووسم "21-03-1979"، چونکە دەزانم هەموو هۆڵەندیزمانێک ڕێکەوت بەو شێوەیە دەنووسێت

بەم دوادواییە، لە هەندێک نووسراوی فەرمیی باشووری کوردستاندا لە دامێنی نووسراوەکەدا بەم شێوەیە ڕێکەوتەکە دەنووسرێت: ٢١ـی ٣ـی ١٩٧٩! ئەمە بە هیچ پێوەرێک ڕاست نییە و ناچێتە خانەی ڕێکەوتەوە، گەر ڕۆژێکیش زمانی ئێمە بووە زمانی بۆ نموونە ئۆپەرەیتینگ سیستمی مایکرۆسۆفت یان هەر سیستمێکی تر، ئەوا ئەستەمە ئەو جۆرە ڕێکەوتانەمان بۆ بخەنە سیستمی گڵۆبالیزەیشنیانەوە!.
لێرەدا نامەوێت بکەومە ناو بابەتی کێشەی ڕێکەوتەوە لە باری تەکنیک و زمانی ئێس کیو ئێڵەوە کە یەکێکە لەو باسانەی کە زۆری لەسەر وتراوە. بەڵام دەبێت ئێمە شێوازێکی واهی هەڵبژێرین بۆ ڕێکەوتەکانمان کە زمانی کۆمپیوتەر و بەتایبەتی تی-ئێس کیو ئێڵ تێی بگات.

## ڕێنووسی هەندێک وشە و دەستەواژە

| "ناتەواو"[16] | "تەواو" یان پێشنیاز |
|---|---|
| بە پێچەوانەوە | بەپێچەوانەوە، بەتەوسەوە، بەئەمەکەوە... |
| گفتووگۆ | گفتوگۆ |

[16] هیچ پێوەرێکی ئەوتۆم نەدیوە کە ئەم وشە و دەستەواژانە، واهی بنووسرێن یان نا، بەڵام ئایا دەبێت وا بێت یان نا، پێویستە ڕێککەوتنمان لەسەری هەبێت. هەربۆیە لێرەدا پێشنیار دەکەم بۆ وەزارەتە پەیوەندداره‌کانی باشوور کە لیستەیەکی تەواوی وشە و دەستەواژەکان پێکبهێنن، تاوەکو ببێتە بنچینەی سپێڵچێکەری کوردی.

| لە نێوان | لەنێوان |
| --- | --- |
| لەبەر ئەوەی | لەبەرئەوەی |
| بە هۆی | بەهۆی |
| هەموو دوو واوکان بکرێنە یەک واو | دو، خانو، بەڵکو، خاتو، هتد. |
| لە لایەن | لەلایەن |
| لە ناو | لەناو |
| هەر بۆیە | هەربۆیە |
| پێک هاتن | پێکهاتن |
| دەستە واژە | دەستەواژە |
| | |

# هەندێک بابەت لەسەر ڕێنووس کە پێشتر بڵاومکردوونەتەوە

## زمان و ڕێزمانی کوردی لە سایەی هەڵبژاردندا! [17]

جار جار لە کەناڵەکانی کوردسات و کوردستان تی.ڤی، ئەو ڕێکلام و پروپاگەندانەم دەبینی کە باسی ئێراقی ئایندە و ئێراقی هیوا و ئاشتییان دەکرد زۆر پەست دەبووم. چونکە جگە لەوەی باسی ئێراق و پیشاندانی ئاڵای ناشرین و خوێناوی ئێراق بوو، هەروەها زمان و ڕێزمانە کوردییەکەشی زۆر کۆڵەوار بوو. ئەو ڕێکلامانە ئەوەندە دووربوون لە هەست و سۆز و زمان و ڕێزمانی کوردییەوە هەر دەتگووت بەرنامەیەکی سۆفتوێری بێ هەست و سۆزی کوردەواری وەریگێڕاوە!.

لێ ساڵ بەساڵ خۆزگەمان بەپار. ئێستا ناوەندەکانی هەڵبژاردن پروپاگەندە بۆ وێبسایتێك دەکەن کە ڕێنیشاندەری "ئێراقییەکان"ە لە دەرەوەی "ئێراق" بۆ دەنگدان و هەڵبژاردن[18] . منیش بۆئەوەی بزانم لەو ماڵپەڕە چ باسە سەردانێکیم کرد و کلیکێکم لەسەر لینکە کوردییەکەی کرد کە ئەویشیان بەهەڵە نووسیوە!. پاش چاوپێداخشاندنی هەندێك دۆکومێنتی ئەو ماڵپەڕە، بەزەییم بە زمانەکەمدا هاتەوە کە بەو جۆرە دیارە بەمەبەستەوەیە سووکایەتیی پێکراوە و پێیدەکرێت، هەر بۆ نموونە پروانە ئەم بڕگەیەی خوارەوە کە لەو ماڵپەرە وەرمگرتووە:

---

[17] ماڵپەڕی کوردستان نێت، ڕۆژی: 18-01-2005

[18] ئەمە ناونیشانی ئەو ماڵپەڕەیە: http://www.iraqocv.org

برنامه ي ده نگداني ده ره وه ي وولات

بيانامه ى چاپه مه ني ريكه وتني وولات

21 ديسمبر 2004

عيراقيه كاني ناو ئوستوراليا ماوه ئه درين بوبشداربون
له هه لبزاردني كو مه له ي نيشتيماني عيراقي له كانووي
دوهه مي 2005 به بي ريكه وتنامه يه ك له بيني حكومه
تي ئوستورالي وكوميته ي دولي ئه واره بون له جينيف.

ئەو زمانە باوەڕناکەم تەنانەت کوردیی پەنجاکانیش بێت. لەخۆم دەپرسم ئایا کوردێت هەبێت لەم کاتەدا ئەوە زمان و نووسینی بێت؟. ئایا دەبێت زمانی دووەمی وڵاتێك بەو شێوەیە بکرێتە نوکتە و گاڵتەجاڕی؟. دەبێت ئێمە ئەمە وا بەئاسانی بەسەرماندا تێبپەڕێت؟. ئایا ئەمە تێپەڕاندنی هێڵێکی سووری ترمان نییە؟..

کە ئەو دۆکومێنتە "کوردی"یانەم بەو شێوە داشکاوە بینی کە نە زمانی زمانە و نەرێزمانی کوردییە و نە رێنووسیشی کوردییە، باشتر لە پاشەرۆژی کورد لەو ئێراقەدا دڵنیابووم. باشتر بۆم دەرکەوت کە سەنگی کورد لەو ئێراقەدا لەو زمانەی باشتر نابێت. تکایە سەردانی ئەو ماڵپەڕە بکەن و بزانن کە چۆن لە ئێراقێکی بێهێزدا هێشتا چ شتێك نەبووە سووکایەتیمان پێدەکرێت!. ئەی ئەگەر ببنەوە خاوەنی خۆیان دەبێت بەچی بگەین!...

15-01-2005

ماڵپەڕی کوردستان نێت

## چەند نووسەر هەیە، هێندە رێنووسیش هەیە! [19]

لاهای - هۆڵندا
07-04-2009

بە رێنووس دەستپێدەکەم و ناچمە گێژاووی ئەو زمانەی کە من و تۆ و ئەو پێی دەنووسین، چونکە ئەگەر ئەو سەرباسەم راست بێت، ئەوا چەند نووسەر هەیە، هێندە زمانی نووسینیش هەیە!. دیارە مەبەستم بەلایەنی کەمەوە کورد و نووسینی کوردییە.
پێش هەرشتێك من زمانزان و رێنووسزان نیم، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت تێبینیم لەسەر ئەو دیاردە سەیرانەی ناو نووسینە کوردییەکان نەبێت، بەتایبەتیش لە باری رێنووسەوە.
لە هەفتاکاندا ئەو چەند گۆڤارەی کۆڕی زانیاریی کورد یەکێك بوو لە باشترین دەستکەوتەکانی گفتووکۆی کورد و بەعس. لەو گۆڤارانەدا کەم و زۆر باسی رێنووسی کوردی دەکران. ئەوانە بەڕاستی زۆر بەسوود بوون. لە هەشتاکانیشدا، چونکە باسی سیاسەت و گەندەڵی لە بڵاوکراوە کوردییەکاندا رێگای پێنەدەدرا، هەریەك لە وێژە و بابەتی زمانەوانی بەشی شێریان هەبوو. زۆرجار لەسەر "یایەکی مراوی" بگرە و بێنەیەکی زۆری لەسەر دروست دەبوو.
ئێستا ئەوەی باسی نەکرێت رێنووسی زمانی کوردییە، ئەو رێسایانەشی کەکاتی خۆی کۆڕی زانیاریی کورد دایانان، هەموویان چوونەوە و کەس بەگوێیان ناکات. زۆری گۆڤار و بڵاوکراوە کوردییەکانیش بووە هۆی زۆریی نووسین و نووسەران، ئەوانیش هەریەك بەئارەزووی خۆی رێنووسی تایبەت بەخۆیان دادەهێنن، بەبێ ئەوەی لێپرسینەوەیەك بێت و کەسێك گوێ بە رێساکانی نووسین بدات. بارەکە لەدوای راپەڕین هێندە ئاڵۆزبوو، زانای رەوانشاد مەسعود محەمەد دەیگووت: کورد لەسەر هەموو شتێك رێکبکەون لەسەر رێنووس رێکناکەون.

---

[19] بەداخەوە نازانم ئەم وتارەم لە کوێ بڵاوبووەتەوە.

ئێمەی نووسەر وەکو گوێ بە ڕێساکانی ڕێنووسی کوردی نادەین، دیارە ئەگەر هەبن!، ئەوا ڕێسا گشتی و نێودەوڵەتییەکانیشمان پشتگوێخستووە. بۆ نموونە نووسینی واهیت بەرچاو دەکەوێت ئەڵێی بیردۆزێکی ماتماتیکییە، ئەوەندە کەوانە و هێماکانی وەك {}«»#[]<>%+= ی تێدا بەکارهێنراوە!. ئەمە لە کاتێکدا بەپێی ڕێسا گشتییەکان، لە نووسینە ئاساییەکاندا دەبێت تەنها کەوانەی لە جۆری (...) بەکاربهێنرێت.

کەم نووسین هەیە لە باری ڕێنووسەوە نیشانەی پرسیار و سەرسوورمان و کەوانەی بەدرووستی تێدا بەکارهاتبێت. زۆرینەی ئەو نووسینانە هێمای "سپەیس" واتە پیتی بەتاڵ دەخەنە پێشیانەوە، کە ئەمە بەتایبەتی بۆ تێکستە دیجیتاڵەکان نابێت و زۆرجار ئەو هێمایانە لە وشەکان جوودا دەبنەوە و بەتەنها دەکەونە سەری دێر، کە دیارە ئەمە خواستی نووسەر نییە و هیچ سەری دێڕێکیش بە هێماکانی نیشانەی پرسیار و سەرسوورمان و کەوانەی داخراو دەستپێناکات!.

کێشەیەکی تری ناو نووسینە کوردییەکان پیتی "واو"ە. ئەم پیتە لە زۆر جاردا کە وەك ئامرازی پەیوەندی بەکاردێت، بەهەمان شێوە و واتای "واو"ی عەرەبی بەکاردێت! کە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە. واتە دەنووسێنرێت بەدوای ئەو وشەیەی کە لەپێشییەوەیەتی. پیتی واو لە کوردیدا جگەلەوەی ئامرازی پەیوەندییە، دەکرێت وەك وشەیەکی سەربەخۆش وەك هاوواتایەك بۆ وشەی "لەگەڵ" بەکاربهێنرێت، هەربۆیە دەبێت ئەو تیپە کە کەوتە نێوان دوو وشەوە بەتەنیا و سپەیسێك لە پێشییەوە و سپەیسێك لەدوایەوە بنووسرێت.

ئەگەرچی ڕێسای ڕێنووسەکان دەبووایە لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە دابنرانایە! بەڵام ئەگەر ئەو وەزارەتە بۆ ماوەی هەژدە دانەساڵ نەیتوانیبێت فۆنتێکی کوردیی یەکگرتوو دروستبکات!، چۆن دەتوانێت گرنگی بە ڕێنووسی کوردی بدات. کۆڕی زانیاریش هەر هیچ کە ئێستا بووەتە ئەکادیمیا و هەر دەنگی نییە.

هیوادارم نووسەران باشتر خەریکی ڕێنووس و دیکتەی نووسینەکانیان بن و بەهیوای وەزارەتە ساوا تەمەن هەژدەساڵییەکەی ڕۆشنبیری نەبن.

## رووبەری داهێنان و زنجیرە پرس و رایەك![20]

سازدانی دیمانە: هێمن مەلازادە

پ8/ یەكێك لەو بوارە تازانەی كە زمانی كوردی خەریكە گەشەی تێدا دەكات، مەسەلەی كۆمپیوتەر و ئینتەرنێتە، لەم ڕووەشەوە ناكرێت رۆڵی بەڕێز هاوڕێ باخەوان لەبەرچاو نەگیرێت، با پرسیارێكی سادە بكەین، ئایا بە راستی ئەوەی تا ئێستا لە كۆمپیوتەر و لە ئینتەرنێت بە زمانی كوردی كراوە و دەكرێت تا چەند شایستەی ئەوەیە كە گەنجێكی كورد لە پارچەكانی دیكەی كوردستان دڵی پێی خۆش بێت؟

وەڵام: سوپاستان دەكەم كە لەو رووەوە رۆڵی من لەبەرچاو دەگرن!

لەڕاستیدا دڵپێخۆشبوونەكە گشتگر نییە، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی زمانی یەكگرتووی كوردی، كە دەبووایە ئێمە ئێستا پاش بیست ساڵ فەرمانڕەوایی كوردی، بمانبووایە!.. نەبوونی زمانی یەكگرتووی كوردی كێشەكانی ئاڵۆزتر كردووە، كورد بە چەند شێوەزمان و چەند رێنووسێك دەنووسێت.. هەربۆیە لێكتێگەیشتنیش ئاسان نابێت و ناشتوانین وەك پێویست بچینە ناو زانستی دیجیتاڵەوە. بۆ نموونە ئەگەر داوا لە كۆمپانیایەكی وەك مایكرۆسۆفت بكەین ویندۆزمان بۆ بكات بە كوردی! پێی بڵێین بۆ كام شێوەزمان و بە كام رێنووس! لەوەوە پروانە هەموو لایەنەكانی تری زانستی ئای تی بەگشتی!.

بەڵام لە لایەكی ترەوە بوونی ئنتەرنێت هۆكارێكی گرنگە بۆ زانین و ناسینی پارچەكانی كوردستان بەیەكتری، من زانیاریی زۆرم بەهۆیەوە دەستكەوتووە و لەو رووەوە زۆر خۆم بە قەرزاری ئنتەرنێت دەزانم..

پ9/ تۆ یەكێك بووی لە كەسە یەكەمینەكان كە خەمخۆرییەكی گەورەت نواند لە مەسەلەی داخلكردنی زمانی كوردی بۆ ئینتەرنێت، ئایا ئەم هەوڵە تاكە كەسییەی هاوڕێ باخەوان، دیسان زادەی خەونبینینی گەشەسەندنی پێشكەوتنی زمانێكی جوانی پاراوی كوردی بوو، یان ئەوە باخەوانی هاندا كە ئیتر زمانی كوردیش نابێت لەبیر ببرێتەوە و دەبێت بە قەدەر خۆی خزمەتی بكرێت؟

[20] لەم دیمانەیەدا ئەو پرسیار و وەڵامانەی كە پەیوەندییان بەباسی رێنووسەوە نییە لامبردووون.

وەڵام: لە راستیدا ئەمە چیرۆکی خۆی هەیە! ساڵی 1994 ویستم نامیلکەیەك لەسەر راپەڕینەکەی بەهاری 1991ی باشووری کوردستان چاپ بکەم، ناوەڕۆکی ئەو نامیلکەیە کۆرێکم بوو کە لە هەمان ساڵدا لە رواندز گرتم.. کێشەی چاپم هەبوو و لە هۆڵندا نەمزانی چۆن چاپ و بڵاوی بکەمەوە.. پاشان تایپرایتەرێکی فارسیم لە کاك (بەختیاری شەمەیی)یەوە وەرگرت و کەوتمە تایپی کتێبەکە! ئەگەرچی پێشتر کەمێك کارم بە تایپرایتەر کردبوو، بەڵام کارێکی تابڵێی ناخۆش بوو، بەتایبەتی کە دەبووایە دێڕەکان درێژییان وەکو یەك بووایە تاوەکو لای چەپیشی رێك دەربچووایە.. هەر لەو ساڵەدا بریارمدا کۆمپیوتەرێك بکڕم و کاروباری تایپی نووسینەکانمی پێبکەم.. هاوسەرەکەشم خوێندنەکەی لەسەر کۆمپیوتەر و ئای تی بوو، پاش ئەوەی کۆمپیوتەرێکمان لە ساڵی 1995دا کڕی، چەند کۆرسێکم  هەر لەو ساڵەدا بینی و زۆرباش کۆرسەکانم تەواوکرد، ئیدی لەو کاتەوە کەوتمە دنیای کۆمپیوتەر و سفر و یەکەوە! ساڵی دووایی لە پەیمانگای نێتوێرکینگ لە شاری لاهای وەرگیرام و ئەویشم تەواوکرد.. ساڵانێکی زۆر کاری بەرنامەوانیی ئنتەرنێت و بەرنامەی ویندۆزم بەچەندین زمانی بەرنامەوانیی جیاواز لە چەندین کۆمپانیا کردووە، ئێستا پاش ئەو هەموو ساڵە لەوانەیە دەیان کۆرس و راهێنانم بینیبێت و لەوکاتەوە بژێویی خۆمان لەسەر ئەو لایەنەیە و هەرگیز هەست ناکەم کە من کەسێم کاتی خۆی یاسام خوێندبێت و مافناس بم!. تاوەکو ئێستا کە بوومەتە ئای تی مەنیجەر لای نەتەوە یەکگرتووەکان و تەواوی داتابەیسەکانی دادگای یۆگۆسلاڤیا من بەرپرسیاریانم و بەڕێوەیاندەبەم..

من هەر لە بەراییی دەرکەوتنی ئنتەرنێتەوە، بەگەڵی کەوتم و زۆر بە گرنگم دەزانی.. سەرەتا زمانی کوردی زۆر کەم بەکاردەهێنرا.. بەڵام پاشان وردە وردە زۆر بوو و منیش یەکێکم لەو سەربازە ونانەی کە کارم بۆ ئەوە کردووە و تاوەکو ئێستاش هەر بەردەوامم..

پ10/ با پرسیارێکی جەوهەریی بکەین لەسەر باخەوان دۆت کۆم، ئێمە هەر رۆژێك سەیری سایتەکەی بەڕێزتان دەکەین، مێژووی رۆژێکمان بە تەواوەتی لە پێش زایینەوە هەتا ئێستا دەداتێ، ئایا ئەمە تا چەند خوێنەر بۆ ئەوە رادەکێشێتەوە کە خوێنەر زاکیرەیەکی بەهێزی هەبێت بۆ گەڕانەوە بۆ رووداوەکان، ئایا ئەو هەوڵەی تۆش لەسەر ئەو بنەمایە بەرهەم هات؟

وەڵام: ساڵی 1998 کە لە کۆمپانیای (ماگناشۆپ ئنتەرناشیۆناڵ بی ڤی)ی هۆڵەندی کارم دەکرد، بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە وەك دەستخۆشانەیەك بۆ چەند ماڵپەڕێکی عەرەبی کە بۆ کۆمپانیاکە دروستم کردبوو، پێی گووتم کە دەتوانم لەسەر بودجەی کۆمپانیا دۆماینێکی تایبەت بەخۆم و هۆستینگی بێسنوورم هەبێت، دیارە ئەوکاتە ئەوانە زۆر گران بوون!، منیش لەو کاتەوە بوومە خاوەنی باخەوان دۆت کۆم. ئەو ماڵپەڕە یەکێکە لە دۆماینە بەراییەکانی مێژووی ئنتەرنێتی کوردی.. هیچ کاتێك ئەو دۆماینەم بۆ مەبەستی بازرگانی بەکارنەهێناوە، هەرچی نووسینی من هەیە لە کتێب و وتار و دیمانە لەسەر ئەو ماڵپەڕەن.. زۆرجاریش کتێبی نووسەرانی تر کە هۆستینگیان نەبووە داmناوە تاوەکو خەڵکی بیانبینێت..

ساڵی 1999، پێش چاپ و بڵاوبوونەوەی پەڕتووکی هاورێنامە لەلایەن دەزگای سەردەمەوە، تەواوی داتابەیسی هاورێنامەم خستە سەر باخەوان دۆت کۆم و ماشێنێکی گەڕانم پێیەوە گرێدا تاوەکو خوێنەران لە داتابەیسەکەدا بگەڕێن و زانیاریی تێدا بدۆزنەوە! لەوانەیە ئەوە کۆنترین یان یەکەمینەکانی سێرچ مەشینی کوردی بێت لەسەر ئنتەرنێت! دیارە دڵنیا نیم لەوە..

پاشان وایلێهات کە رۆژانە میوانانی دۆماینەکە رووداوەکانی رۆژیان بە ئۆتۆماتیکی دەستبکەوێت.. هەمان رووداوەکانی رۆژ کە ساڵانێکە تەلەڤزیۆنە کوردییەکان سوودی لێدەبینن و هەندێکیان تەنانەت کۆماکانی منیش بڵاودەکەنەوە، بەبێ ئەوەی رۆژێك لە رۆژان باسی سەرچاوەی هاورینامەیان کردبێت! ئێستا بووەتە (ئاڕ ئێس ئێس فید) و هەر ماڵپەڕێکی کوردی دەتوانێت ناوکێشی بکات لە ماڵپەڕەکەی خۆیەوە و رووداوەکانی رۆژ پیشانی میوانانی بدات..

خۆشبەختانە زۆر کەس سوودی لە رووداوەکانی رۆژ وەرگرتووە و زۆرێك ئیمێڵ و دەستخۆشانەم بەدرێژایی ساڵانی رابردوو پێگەییشتووە کە دەتوانم بڵێم سەدان و بگرە زۆرتریشە و هەموویيم لای خۆم پاراستوون..

پ11/ سایتی کوردیپێدیا سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندە بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی لەسەر تەواوی کەس و رێکخراوو ناوچەکان، ئەوەیان زادەی چی بوو؟

وەڵام: من لە ساڵی 2005ەوە لە فراوانترکردنی هاوڕێنامە وەستام، ئەویش زۆرتر بەهۆی هۆکاری چاپنەکردنەوەیەوە بوو! پرۆژەی کوردیپێدیا دەمێك بوو لە بەرنامەمدا بوو، بەتایبەتی کە کۆمەڵێك سەرچاوەی باشم بۆی هەبوو، لەوانە: هاوڕێنامە و داتابەیسی ناونامە و ئەو ئەرشیفە دیجیتاڵەی کە ساڵانی رابردوو کۆمکردبوەوە. کوردیپێدیا لەسەر ئەو سەرچاوانە وەك (داتاوێر هاوس)ێك دروستبوو، شارەزاییی چەند ساڵەشم لە بەرنامەوانی و داتابەیس دیزایندا زۆر یارمەتیدەرم بوو و ئەو کوردیپێدیایەی لێپێکهات کە ناوم ناوە (پڕزانیاریترین سەرچاوەی کوردی!)..

کوردیپێدیا، پرۆژەیەکە بۆ کۆکردنەوەی هەر زانیارییەکی پەیوەست بە کوردستان و کورد و بەهیوایە لە پاشەڕۆژدا زۆر پڕزانیاریتر بێت و بەهۆیەوە بەئاسانی بزانرێت: کێ، کێیە؟! و کوێ، کوێیە؟! و چی، چییە؟!...

کوردیپێدیا وشەیەکی لێکدراوە و لە کوردی و پێدیا پێکهاتووە. وشەی پێدیا، وشەی دووەمی وشەی لێکدراوی گریکیی ئەنسیکلۆپێدیایە (enkyklia paideia)کە بەواتای ناسین یان زانینی یاخود زانیاریی گشتی دێت. وشەی کوردیپێدیاش لەوەوە داتاشراوە و دەکرێت واتای کوردناسی، کوردیناسی یان کوردزانین یاخود زانیاریی کوردی بدات. دڵنیا نیم، بەڵام لەوانەیە وشەی پەیی کوردی یان پەیپێبردن هەر هەمان رەگوریشەی پیدیا بێت!.

بەکورتی کوردیپێدیا، هەوڵێکی (پرۆفیشناڵ)انەیە بۆ کۆکردنەوەی و خستنەڕووی زانیاریی پەیوەست بە کوردستان و کوردەوە..

دەمێکە بەنیازی نووسینێکم لەسەر زانیاری و چۆنێتیی زانیاری وەدەستخستن و تایبەتمەندییەکانی، بەڵام ماوەیەکە لە نووسیندا زۆر تەمبەڵ بووم و هیوادارم لە پاشەڕۆژدا ئەمەم بۆ بکرێت..

پرۆژەکە خۆشبەختانە زۆر بەخێرهاتنی لێکراوە و خەڵکانێکی زۆر سەردانی دەکەن و زانیاریی لێوەردەگرن و راپۆرتی لێوە دادەبەزێنن. خەڵکانێکی زۆریش یارمەتی بۆ کوردیپیدیا دەنێرن بەناردنی بابەت و وێنە و راستکردنەوەی زانیاریی ناتەواو، کە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە کوردیپێدیا ئنتەرئەکتیڤانە لەگەڵ سەردەرەکانیدا کاربکات.. هیواشم فراوانبوونی زۆرتریەتی و دەکرێت بگووترێت لەم کاتەدا داتابەیسەکەی، دوای داتابەیسی دەزگاکانی زانیاری و پاراستن، گەورەترین داتابەیسی کوردییە.. ئێستا کوردیپیدیا خاوەنی دەیان هەزاران بابەت و هەزاران وێنەیە.. ئامانجیشی ئەوەیە ژمارەی بابەتەکانی بگەیەنێتە یەك ملیۆن

بابەت! تاوەکو هەرکەسێك بیەوێت بەدوای هەر شتێکدا بگەڕێت، نائومێد نەبێت و زانیاریی پێویستی لەسەر بابەتی داواکراو دەستبکەوێت..

بەرنامەی کاری زۆرترم بۆ کوردیپێدیا هەیە، بەوەی بەشێوەزاری بادینی و کرمانجیی پیتی لاتینیش کاربکات و بەنیازیشم وەك رێکخراوێکی لێبکەم و ببێتە ناوەندیکی پرواپێکراوی زانیاریوەدەستخستنی کوردەواری..

پ12/ هەست دەکەی بۆ چەند ساڵی داهاتوو، زمانی شیرینی کوردی هێندە دەبێتە واقیع و دێتە رێزی یەکێك لەو زمانە جیهانییانەی کە بۆ هەر بوارێك بتەوێت تۆ پرسیاری لێ بکەیت، واتە پرسیار لە گوگڵ بکەیت یان لە هەر سێرچێکی دیکە بکەیت، زانیاریی پێویستت دەست بکەوێت؟

وەڵام: دەتوانم بڵێم لە پێنج ساڵی رابردوودا گۆڕانکاریی باش لە بواری زانیاریی تەکنەلۆجیدا هاتووەتە کایەوە، ئەو گۆڕانکارییانەش کورد و زمانەکەیی گرتووەتەوە. بەڵام ئەوەی پەیوەست بە کوردەوەیە وەك پێویست نییە و ئێمە هێشتا زۆرمان ماوە. کێشەکانمان زۆرن! رێنووسی یەکگرتوو و زمانی یەکگرتوو یەکێکن لە شاکێشەکان و دەبووایە لە بیست ساڵی رابردوودا حکومەتی باشووری کوردستان هەنگاوی زۆر گەورەی بنایە، بەڵام هیچی نەکردووە! ئەو کێشەیە دەبێت دامەزراو و سیستم چاری بکات و لە توانای یەك کەس و سەد کەسدا نییە!..

گووگڵ و هەر سێرچ ئەنجنێکی دی، هەرچی لە داتابەیسەکەیدا تۆمارکرابێت، هەر ئەوەت دەداتێت و هیچی تر، ئیدی ئەگەر سۆرانی و پیتی ئارامی یان بادینی و پیتی ئارامی یان لاتینی بێت، هەر ئەوەت پیشاندەدات!.. بەڵام ئایا زانیاریی پێویستت دەستبکەوێت، ئەوەیان دەکەوێتەوە سەرخۆمان کە تاچ رادەیەك زانیاری و دۆکومێنتمان لەسەر نێت هەیە! نەك سێرچ ماشینەکان!..

پ13/ با بگەڕێینەوە بۆ ناوەندی مەعریفیەکان و زانکۆ و هەروەها خوێندنی باڵا لە کوردستان کە لەمەدا کەمتەرخەمییەکی زۆر گەورە هەیە، تەنانەت زانکۆ و پەیمانگاکانی ئێمە سایتێکی پێشکەوتوویان بۆ دامەزراوەکانی خۆیشیان نییە، ئایا ئەم کەمتەرخەمییە لە خزمەتکردن بە زمانی کوردی و خزمەتکردن بە زانیاری و داتا بە زمانی کوردی، خەتای کێیە، ئایا ئەمەش دیسان خەتای کۆی سیستمی سیاسیی وڵاتە، یان خەتایەکە خەتای تاکە کەسە، چونکە جۆرێك لە ئیمکانیەت هەیە کە

ئەوان بتوانن سایتێکی پێشکەوتوو پێشکەش بکەن و بە زمانی کوردی دەیان زانیاریی لەسەر بواری پزیشکی، بازرگانی، ئابووری، رۆژنامەوانی ....هتد، پێشکەش بکەن؟

وەڵام: ئەگەر ئەوانەی کە لە باشووری کوردستان لەم سەردەمی تەکنەلۆجیای زانیارییەدا سایتێکی پێشکەوتوویان بۆ دامەزراوەکانی خۆیان نەبێت، ئیتر چۆن من پێیان بڵێم ناوەندی مەعریفی و زانکۆ و خوێندنی باڵا!..

ئەوانە خەتای تاکەکەس نییە، من بەردێك لە ئاسمانی باشووری کوردستان بکەوێتە خوارەوە و بیدات بەسەری خودی دەستەڵاتیشدا! هەر خەتای دەستەڵات خۆی دەگرم، ئەوانە دەبێت سیستمی فەرمانڕەوایی بیکەن و کاری تاکەکەس نییە، تاکەکەس رۆڵی لەو پرۆژە گەورانەدا یەکەم جێبەجێکەر و بەرەوپێشبەری پلانەکەیە، دووەمیش کە گرنگترینیانە، سوودمەندبوونە لەو پلانە..

ئەوەی من تێی گەییشتبێتم دەستەڵاتی کوردی ئەوەی خەمی نەبێت و ئەوەی بیری لێنەکاتەوە زمانی کوردییە، ئەمە کارێکە من ناتوانم تێبیگەم بۆ و لەبەرچی؟! تکایە هەر کەسێك ئەوە دەزانێت، ئەوا زۆر سوپاسی دەکەم ئەگەر منیش تێبگەیەنیت بۆ؟!.

ماڵپەڕی وەزارەتی رۆشنبیری بکەرەوە، رێنووس و دەستەواژەی وا ئەنتیکەی تێدایە شاخت لێدەڕوێنێت! لە دۆکومێنتە فەرمییەکانی حکومەتدا هەریەکە و بەئارەزووی خۆی رێنووس و زمان دادەڕێژێت.. تکایە ئەو ئەرکە بکێشن و سەیرێکی ئەو سەدان هەڵە رێنووسی و زمانەوانییانە بکەن کە من لە رەشنووسی دەستووری هەرێمی کوردستانم گرتووە و لەسەر باخەوان دۆت کۆم ئامادەیە و ئیدی خۆتان ئازادن لەوەی پێی پێدەکەنن یان بۆ زمان و رێزمانی دەستووری هەرێمی کوردستان دەگرییێن!..

ئێستاش پاش بیست ساڵ، لە دۆکومێنتە فەرمییەکاندا یەکێك دەنووسێت، دەبێت! ئەوی دی دەنووسیت ئەبێ! نەخێر یەکێکی تر ئەبێتی پێ راستترە! یەکێکی تر دەنووسێت ئەبێتن! یان دەبێتن یان و نازانم چیی تر! ئەمە کارەساتە، کارەسات! و نازانم ئەو دۆکتۆراگەل و زمانەوانگەلانەی زانکۆکانمان چ دەکەن و کاریان چییە!..

پ14/ ئەگەر هەوڵی تاکە کەسی خەڵکانی وەکوو ئێوە نەبوایە، چونکە هەرچی تا ئێستا کراوە و کۆی شتەکان تاکە کەسین، تا چەند

کورد زەرەری لەوە دەبینی کە بەزمانی شیرینی خۆی، کەمترین زانیاریی لە سێرچەکانی ئینتەرنێت بەدەستکەوتبایە؟

وەڵام: ئێمەمانان، هەرچییەکمان کردبێت بە بەرنامەیەکی تەواوەوە نەبووە، هەربۆیە کارەکانمان کەموکوریی زۆری تێدایە! بەڵام بەوەشەوە هەر توانیومانە بەردێك بخەینە سەر دیواری دیجیتاڵی کوردستان و کوردا!.

دیسان دەگەڕێمەوە بۆ دەستەڵات! کاری دامەزراوەکانی دەستەڵاتە پیتی دیجیتاڵی کوردی دروستبکات، نەك ئەم کەس و ئەو کەس!.. کاری دامەزراوەکانی دەستەڵاتە کە ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییەکان و بەرنامە بەربڵاوەکان بکاتە کوردی نەك من و تۆ!..

هەڵبەت ئەگەر من و تۆ و ئەو، بە خۆرسکانە و خۆبەخشانە کارمان لەو بوارەدا نەکردایە و بەهیوای دامەزراوە کوردییەکان بووینایە! ئێستا شتێکی ئەوتۆ نەدەبوو پێی بگووترێت زمانی کوردی لە جیهانی سفر و یەکدا!.

حکومەتی بەعس بەو هەموو خوێن و تاوانەوە، چونکە دامەزراوەی هەبوو، هەر زوو پیتە کوردییەکانی کردە ناو بەرنامەیەکی (دۆس)ەوە و پێش سەرهەڵدانی ویندۆز دەتتوانی بەکاریبهێنیت و تێکستی کوردیی بەسەروبۆرەوە پێبنووسیت!..

پ15/ با بچینە بوارێکی دیکە ئەویش بواری میدیاکانە، میدیاکان بە چاك و بە خراپیانەوە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندن بۆ دونیای ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر، ئێستا قسەمان لەسەر ئەوە نییە بە رۆژ و بە خولەك چییان کردووە یان نا؟ بەڵکوو قسەمان لەسەر ئەوەیە ئەگەر بەرێزتان لەسەر ئاستە گشتییەکە بینین، ئایا ئەمە خزمەتێکە بۆ بەرەوپێشچوونی رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی کە وشەی جوان لەسەر کورد هەبێت لە ئینتەرنێتدا، یان بە پێچەوانەوە ئەوان هێندە فرە زار و هێندە بێ رێنووسن کە ئەوانەش لە ڕوویێکەوە جۆرێکن لە زەڕەبەدان لە زمانی کوردی؟

وەڵام: میدیاکان، بەگشتی کاری زۆریان کردووە لەسەر ئنتەرنێت.. ئەوانە توانیویانە ملیۆنان لاپەڕەی کوردی بخەنە بەردەم خوێنەری کوردی لەسەر ئنتەرنێت و لەو رووەوە کارێکی گەلێك باشە، بەڵام دیارە لایەنی خراپیشی زۆرە! خراپی رێنووس، رێزمان و نەبوونی زمانی یەکگرتووی کوردی بووەتە هۆی ئەوەی کە زۆر لە نرخی هەوڵی ئەو میدیایانە بهێنێتە خوارەوە.. ئەگەر لەمەدا قوڵببینەوە، ئەوا هەر دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەر بێ بەرنامەیی دەستەڵاتی کوردی کە نەیتوانیوە ئەو میدیایانە ئاڕاستە

بکات تاوەکو بەشێوازێکی باشتر و ڕێنووسێکی پوخت کارەکانیان بخەنە بەردەستی خوێنەرانیان!..

دەستەڵات تاوەکو ئێستا نەیتوانیوە تەنانەت کتێبێکی ناوی منداڵان بکاتە یاسا و لە فەرمانگەی ناونووسکردنی منداڵانی تازەلەدایکبوو دایبنێت و بیکاتە پێوەر، ئیدی وادیارە ئێمە داوای شتی زۆر گەورەی لێدەکەین!..

پ16/ بەوپێیەی کە کورد زمانی ستانداردنی نییە وەك عەرەب کە قورئانی کردووەتە زمانی ستانداردی خۆی، تا چەند زەرەر لەوە دەبینن کە بۆ ئاییندەیەکی دوور ئەگەر زمانی ستانداردنی کوردی دروست بوو و بەلایەکدا شکایەوە جا بۆ نموونە سۆرانی بێت یان کرمانجی، تا چەند ئەو زانیارییانە دەفەوتێن ئەوەی کە ئێستا هەیە؟

وەڵام: هەڵبەت هێزکاری خراپی دەبێت، بەڵام بەو شێوەیەش نییە، ئێستا تەکنەلۆجیای زانیاری ئەوەندە پێشکەوتووە کە زۆر بەئاسانی لە چەندین زمانەوە بۆ چەندین زمانی تر دۆکومێنتی بۆ وەردەگێڕیت و بە کوالیتیی زۆر باشیشەوە، زمانی چینی و عەرەبی فڕیان بەسەر یەکترەوە نییە و دەتوانیت لای زۆرێك لە ماڵپەڕ و ماشێنی گەڕانەکان دۆکومێنتی بۆ - یان لێوەربگێڕیت! کە ئەوە بەئاسانی بلوێت! ئیدی بۆچی لە شێوەزارێکەوە بۆ شێوەزارێکی تر نەلوێت! بەڕای من زۆر ئاسانترە و کوالیتیی وەرگێڕانەکەشی زۆر لە دوو زمانی جیاواز باشترە..

من ماوەی ساڵێك لە دادگای لاهای، لە پڕۆژەیەکی لەو جۆرەدا کارم کردووە بۆ وەرگێڕانی زمانەکانی یۆگۆسلاڤیای پێشوو بۆ زمانی ئینگلیزی و بەپێچەوانەشەوە! کارێکە دەکرێت لەنێوان شێوەزمانەکانی کوردیدا بەئاسانی بچێتەسەر و بەرنامەیەك دروستبکرێت دۆکومێنت لەنێوان شێوەزمانەکاندا وەربگێڕێت!..

تورکەکان کاتی مستەفا کەمال کە ڕێنووسەکەیان لە ئارامییەوە کردە لاتینی، شتیان فەوتا! بەڵام زۆرینەی ئەدەب و نووسراوە گرنگەکانی خۆشیانیان کردە سەر ڕێنووسی لاتینی..

من پێم وایە هەندێك شتمان بفەوتێت باشترە لەوەی کە زمانەکەمان بەبێ ستانداردی بمێنێتەوە.. دووبارە ئەوەشیان کاری دامەزراوەکانی حکومەتە کە هەموو ئەو ئەدەبیاتانە وەربگێڕێتە سەر زمانی ستانداردی کوردی لە پاشەڕۆژدا..

دروستبوونی زمانی ستاندارد، ئەوە ناگەیەنێت کە شێوەزمانەکانی تر دەفەوتێن! ئەگەر زمانی ستانداردی ئێمە بێتە کرمانجی و پیتی لاتینی کە ئەمە بەهێزترین گریمانەکانە، ئەوا شیعری (تەبعی شەکرباری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا)ی نالی چۆن دەفەوتێت! هەرگیز نافەوتێت!.. تێکستێك نەمر بێت، هەر بە نەمری دەمێنێتەوە، ئیدی بەهەر زمانێك و بەهەر شێوەزمانێك نووسرابێت!..

پ17/ یەکێك لەو ئیشکالانەی کە تا ئێستا لە سایتی ئەلیکترۆنیدا کەمە ئەوەی زۆربەی ئەو بیرمەند و کەڵەپیاوانەی کە داهێنان و خزمەتێکی زۆریان بە زمان و ئەدەب و فەرهەنگی کوردی و مێژوو گەیاندووە، تا ئێستا سایتێکیان لە ئینتەرنێتدا بۆ دروست نەکراوە، بۆ نموونە بۆ مەسعوود محەممەد دروست کراوە بەڵام کەمترین شتی مەسعوود محەممەد خۆی تێدایە، ئەوە تا چەند جۆرێکە لەکەمتەرخەمی، بە ڕاستیش دەبوایە دەزگا چاپەمەنییەکانی ئێمە و دەزگا فەرهەنگییەکان ئەو پارە زەبەلاحەی لەو وڵاتە بۆ راگەیاندن و شتی دیکە سەرف دەکرێت، تا چەند دەبوایە کارێکی لەو بابەتەیان کردبوایە؟

وەڵام: حەزم نەکرد جارێکی بێمەوە سەر قەوانی سواوی دەستەڵات و هەڵەکانی، ئەوەشیان پەیوەندیی بەپلانی بێپلانی وەزارەتی بۆ نموونە رۆشنبیرییەوە هەیە! ئەگینا کاری ئەو تاکەکەسانە نییە کە ماڵپەڕ بۆ مەسعود محەمەد یان بۆ مەلا شکور و کێی تر دروستبکەن..

دامەزراوێکی حکومی دەبێت کەسانێك لە مێژوو و ئەدەبی ئێمە دیاریبکات کە کارەکانیان کۆبکاتەوە و دیجیتەڵیزیان بکات و ماڵپەڕیان بۆ دروستبکات بە هەردوو زمانی کوردی و ئینگلیزی.. نەك تاکەکەسانێك کە نەتوانن و توانای مادی و کاتی ئەوەیان نەبێت کە هەموو ئەو کارانە کۆبکەنەوە..

دیارە ئەوەش پێوەندیی بە هاوکێشە زانستییەکەوە هەیە، بۆشایی پردەبێتەوە ئیدی بەهەر شتێك بێت.. باش، خراپ، خراپتر یان خراپترین.. کە کاری باش و پلان نەبوو! کاری ناباش و بێپلانی جێی دەگرێتەوە..

لەڕاستیدا وەڵامی پرسیارەکان زۆرتر هەڵدەگرن و ئەگەر بەدڵی خۆم وەڵامیانم بدایەتەوە، کتێبێکی دەکردا نەمویست درێژدادڕ بم و کاتی بەهاداری خوێنەری زۆرتر پێوە بکوژم! بۆیە لە کورتی دەبیرمەوە و سوپاسی ئێوە دەکەم بۆ پرسیارەکانتان و سوپاسی زۆریشم بۆ خوێنەرانم بۆ ئەو کاتەی تەرخانی دەکەن بۆ خوێندنەوەی وەڵامەکان..

لاهای – هۆڵندا
ناوەڕاستی ئاپریلی 2011

---

[1] ئەم دیمانەیە بەسێ بەش لە ژمارەکانی 61، 62 و 64ی رۆژنامەی رووبەری داهێناندا بڵاوبووەتەوە. ساڵی 2011.